له چاپکراوه‌کانی ئه‌میندارێتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوانی

ناوچه‌ی کوردستان

# له بواری

# فه‌رهه‌نگ نوسیی کوردیدا



دوکتۆر

ئه‌وره‌حمانی حاجی مارف

به‌غـــدا - ١٩٨٧

# پێشەکی

مەسەلەی دانانی فەرهەنگ گرنگو گرانە ، بۆیە تاکو ئێستا گەلێ کێشەی تیۆریی فەرهەنگنووسیی پێویستی بە لێکدانەوەو لێکۆلینەوەیە .

سالی ١٩٤٠ زانای بەناوبانگی ڕووس ل . ڤ . شێربا یەکەم وتاری دەربارەی فەرهەنگنووسیی بلاوکردەوە ، کە تێیدا لەسەر کەرەستەیەکی زۆرو فراوان کێشە سەرەکییەکانی تیۆریی فەرهەنگنووسیی دیاری کردووە[1] . ئەگەرچی مەرگ بووە بەرهەلستی ئەوەی شێربا بتوانێ گشت نووسینەکانی لەپارەی تیۆریی فەرهەنگنووسییەوە بگەیەنێتە ئەنجام ، بەلام فریاکەوت ئەوە بچەسپێنێ کە وا فەرهەنگنووسیی تەنها کاری پراکتیکی دانانی فەرهەنگ نییەو بەلکو کارێکی زانستیو تیۆریشە . ئەمەش لەبێو قوتابخانەی فەرهەنگنووسیی سۆڤیەتدا ڕەگی داکوتا .

زمانەوانانی سۆڤێت بەدوا ل . ڤ . شێربادا لەوەوە بۆ مەسەلەکە دەچن : کە وا فەرهەنگنووسی وەك زانستێك دوو دیوی هەیە : تیۆریو پراکتیك[2] . یەکەمیان لەو کێشانە دەکۆلێتەوە کە لە دانانی

---

(١) ل . ڤ . شێربا ، تەجروبەی تیۆریی فەرهەنگنووسیی ، « هەوالەکانی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت » ، ١٩٤٠ ، ژ ٣ .

(٢) گ . ڤ . ستیپانۆڤ ، پێشەکی بۆ تەرجومەی ڕووسی کتێبی « سەرەتایێك بۆ فەرهەنگنووسیی ئەمرۆ »ی ( خ . کاساریس ) ، ل٩ .

هەر فەرهەنگێکدا سەرهەڵدەدەن‌و لە ڕێگای زانستی‌یەوە ڕێگاو ڕێبازی ڕاست بۆ چارەسەرکردنیان دەدۆزێتەوە . دووەمیش ـ لەسەر بناغەی ئەو تیۆری‌یەو لەبەر ڕووناکیی ئەو ڕێگەو ڕێبازەی بۆی دانراوە کاری دانانی فەرهەنگ بەجێ‌دەگەیەنێ . بێ‌گومان دابەش‌کردنی فەرهەنگ‌نووسی بەسەر دوو لایەندا شتێکی ڕاستە . ئەو دوو لایەنەی فەرهەنگ‌نووسی هەمیشە شان‌بەشانی یەکتر دەڕۆن‌و تێك‌ئاڵاون . « پسپۆڕی فەرهەنگ‌نووسی تەنیا بە خەریك‌بوونی بە تیۆریی ڕووت‌و کارنەکردنی لەسەر کەرەستەی خاوو خۆتاقی‌نەکردنەوە بە دانانی فەرهەنگەوە ... سەرناکەوێ . بەپێچەوانەشەوە هیچ فەرهەنگ نووسێك ئەگەر وەك زانستێك زانیاری لە کێشە گرنگەکانی فەرهەنگ‌نووسیدا پەیدا نەکا ، ڕاست نیە خۆی بهاوێتە دەریای فەرهەنگ دانانەوە . جا لە یەك کاتدا بایەخدان بە هەردوو بنکەی فەرهەنگ‌نووسی ، زۆر پێویستە »[٣] .

ئەگەرچی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان بە دەیان نامەی دوکتۆری‌و کتێب ، بە سەدان وتارو لێکۆلینەوە لەبارەی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسییەوە بڵاوکراونەتەوەو چەندین کۆنگرەی بۆ بەستراوەو گەلێ گۆڤاری تایبەتی بۆ تەرخان کراوەو ئامۆژگای بۆ دامەزراوە ، بەڵام دەتوانین بڵێین لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا گەلێ کێشەی دانانی فەرهەنگ نەك هەر ساغ‌نەکراوەتەوە ، بەڵکو پەنجەشی بۆ درێژنەکراوە .

هەموو ئەمە بەسەریەکەوە ، ئەگەرچی هێشتا تیۆریی تەواوو کاملی فەرهەنگ‌نووسی لێ‌پەیدانەبووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو

---

(٣) ل . پ . ستوپین ، بارو بنکەی تۆژەرانی سۆڤێت لەبارەی فەرهەنگ‌نووسیی ئەورووپاو ئەمەریکاوە ، « هەواڵەکانی زانکۆی لێنینگراد » ، ١٩٦٧ ، ژ ٢٠ ، ل ١٦١ .

تیۆرییە گرنگانەی لە کاری فەرهەنگنووسیدا پێویستە ڕەچاوبکرێن ، نیشاندەدەن .

لەم بارەیەوە ئەوەی پێوەندی بە کاری دانانی فەرهەنگی کوردییەوە هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە مێژوویەکی کۆنی هەیە ، کەچی هیچ باس و کەرەستەیەکی تیۆری دەربارەی نەنووسراوە . جا لەو ڕایەدام کە لێدوان و لێکۆڵینەوە لە فەرهەنگە کوردییەکان نەك هەر دەبێتە ڕابەرو ڕێ نیشاندەری فەرهەنگنووسەکان ، بەڵکو دەشبێتە سەرچاوەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی تیۆریی فەرهەنگنووسیی کوردی ... بۆیە لەو وتارانەدا ، کە لە سەرەتای سالآنی حەفتاوە تا ئەمڕۆ لەبارەی فەرهەنگە کوردییەکانەوە بڵاومانکردۆتەوە ، هەوڵمانداوە لە ڕێگای نرخاندن و ڕەخنەو شیکردنەوەو موناقەشەکردنیانەوە ئەو کێشانەی لە کاری فەرهەنگنووسیی کوردیدا هەیە بخەینە پێش چاو تا بەو پێیە بتوانین بناغەی تیۆریی فەرهەنگنووسیی کوردی دابمەزرێنین .

بۆ ئەوەی ئەو وتارانەم لە پەرش و بڵاوی و فەوتان ڕزگاربکەم و بۆ ئەوەی فەرهەنگنووسە بەڕێزەکانمان بتوانن کەڵکی تەواویان لێوەرگرن ، بەپێویستم زانی کۆیان بکەمەوەو بیانکەمە کتێبێك . ئەم بەرهەمە ــ « لە بوای فەرهەنگنووسیی کوردیدا » ــ بەشێکن[٤] لەو وتارانەی لەبارەی کاری فەرهەنگنووسیی کوردییەوە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوم کردوونەتەوە .

بە هیچ چەشنێك دەستکاریی ناوەرۆکی وتارەکانم نەکردووە ،

---

(٤) وێرای ئەو وتارانە ، هەندێ وتاری دیم بە کوردی هەیە ، کە خستوومنەتە ناو کتێبی ترەوەو بە پێویستم نەزانیوە دووپاتیان بکەمەوە . هەروەها بە زمانی ڕووسیش دوو وتارم بڵاوکردۆتەوەو لێرەدا چاپکردنیان ئاسان نییە .

تەنیا ئەگەر شتێك لە چاپدا پەڕیبێ خستوومەتەوە شوێنی خۆی یاخود شتێك قبوول نەکرابێ لامبردبێ • لە ڕووی شێوەو شێوازی نووسینەوە تەنیا لە چەند شوێنێکی کەمدا ناچاربووم جێگەی هەندێ وشە بگۆڕم • بەڵام ئەوەی پێوەندی بە ڕێنووسەوە هەیە بۆ مەبەستی باشخوێندنەوە دەستکاریی زۆرم کردووەو ئەمەش هیچ لە جەوهەری مەسەلە سەرەکییەکە ناگۆڕێ •

لەدایكبوونی هەر فەرهەنگێکی گەورەی کوردیی نوێ کارێکی گرنگی بۆ سەر فیلۆلۆژیی کوردی هەیە بەگشتی • چونکە لە هەر کارێکی وەهادا دەبێ هەموو لایەنە چاکەکانی کارەکانی پێشتر ڕەنگیدابێتەوەو هەموو ناتەواوییەکانیش دوورخرابنەوە • هەروەها پێویستە لەسەر بناغەی کەرەستەی نوێ هەندێ کێشە ساغکرابێتەوە ••• مایەی بەختەوەریم دەبێو هیواو ئاواتێکی گەورەمە دێتەدی ، ئەگەر بتوانم بەم کارە خزمەتێکی بچووك پێشکەش بە فەرهەنگنووسەکانمان بکەمو لەبارەی کاری فەرهەنگنووسیی کوردییەوە چەند وشەیەکی بەکەڵك بنووسم •

د• ئەورەحمانی حاجی مارف

# فەرهەنگی خـال

فەرهەنگ‌نووسی لــە کوردەواریدا لــە مێژە دەستی پێ کراوە ، کۆنترین فەرهەنگ کە نووسرابێ فەرهەنگی « نەوبەهار »ە ، کە لــە لایەن ئەحمەدی خانی‌یەوە نووسراوە لە سالی ١٠٩٤ك / ١٦٨٢زدا • دوابەدوای ئەم فەرهەنگە گەلێك فەرهەنگی هەمەچەشنە : ( عەرەبی ــ کوردی ، کوردی ــ عەرەبی ، ئیتالی ــ کوردی ، کوردی ــ ڕووسی ، ڕووسی ــ کوردی ، کوردی ــ فەرەنسی ، کوردی ــ ئەڵــەمانی ، کوردی ــ ئینگلیزی ••• هتد )[1] نووسراوە چ لە لایەن کوردەوەو چ لە لایەن بێگانەوە • بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین کە فەرهەنگ‌نووسیی کوردی هەمەچەشنە بناغەیەکی پتەوو ڕەگێــکی درێژی هەیە • بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، بەداخەوە تاکو ئێستا گەلێك فەرهەنگی پێویستمان نییەو ناتەواوی زۆرە لە کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا •

هەروەها تاوەکو سالی ١٩٦٠ فەرهەنگێکی کوردی ــ کوردیمان نەبوو • هەست و چالاکیی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ توانییان ئــەم کەلەبەرە پڕبکەنەوە • ئەوە بوو لە سالی ١٩٦٠ــ١٩٦٤دا بەرگی یەکەم و دووەمی « فەرهەنگی خاڵ »[2] دەرچوو ، کە تا کۆتایی پیتی ( ق )

---

(١) لێکۆڵینەوە لــەو فەرهەنگانە ، کــە بەشێکن لــە نووسراوی « مێژووی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی » بە چەند وتارێك پێشکەشی ئەکەین .

(٢) شێخ محەمەدی خاڵ ، « فەرهەنگی خاڵ » ، سلێمانی ، بەرگی یەکەم ، ١٩٦٠ ، بەرگی دووەم ، ١٩٦٤ •

دەگرێتەوە • بۆ ئەو بەشەی ماوە بەپێی زانینی من هێشتا دەرنەچووەو هۆی چییە نازانم • هیوادارم کە دەرچووبێ‌و من هەڵەبم ، یاخود ئەگەر دەرنەچووبێ ، مامۆستا خاڵ دەستی لێ‌هەڵنەگرتبێ‌و ئەو کارە بەنرخە پێویستە گەلی کوردمان بێ‌بەش نەکا •

« فەرهەنگی خاڵ » یەکێکە لە هەرە چاکترین فەرهەنگە چاکەکانی کوردی • بەرهەمێکی باشی پێگەیشتووی نوێیە ؛ کەڵکێکی زۆری هەیە بۆ زوربەی خوێندەوارانی کوردستان ، ئەویش هۆی ئەو رێگا راستەیە کە مامۆستا خاڵ گرتوویەتی لە نووسینی فەرهەنگەکەیدا ، بەوەی کە ناوەرۆکی فەرهەنگەکەی بریتییە لە وشەکانی گەلێك لە ناوچەکانی کوردستان ، وەك مامۆستا خاڵ خۆی ئەڵێ : « لە ساڵی ( ١٩٣٥ )ەوە بە هەموو هێزو تەواناى خۆمەوە خەریکی کۆکردنەوەی وتەی کوردیم بە هەموو ئاهەنگ‌و شێوەکانیەوە بە وتەی بابان‌و سۆران‌و ، زازاو ، بۆتان‌و ، بادینان‌و ، لوڕو ، فەیلی‌و ، لەك‌و ، موکریان‌و ، ئەردەڵانەوە وە لەم رێیەدا زۆر رەنجم داوەو کۆششم کردووە تا وتەی راست‌و دروستم کۆکردۆتەوە ••• »[٣] • ئەم جۆرە رێگایە بۆ ئەوەی فەرهەنگ بەکەڵك بێت نەوەك تەنها بۆ خوێندەوارانی ناوچەیەك لە کوردستان بەڵکو بەکەڵك بێت بۆ زوربەی کوردان رێگایەکی راست‌و پێویست‌و نوێ‌و بەسوودە بۆ ئەوەی کە لە فەرهەنگ کۆمەڵێکی فراوان‌و زۆر لە کوردان کەڵك وەربگرن‌و هەروەها رێبازە بۆ یەکخستنی شێوەکانی زمانی کوردی‌و سەرچاوەیە بۆ سازبوونی زمانی ئەدەبی بۆ گەلی کوردمان •

وەك لە سەرەوە وتمان « فەرهەنگی خاڵ » یەکەم فەرهەنگی کوردی ـــ کوردییە ، لەبەر ئەوە گەلێك کۆسپ لە رێگای دانانی ئەم

---

(٣) شێخ محەمەدی خاڵ ، « فەرهەنگی خاڵ » ، بەرگی یەکەم ، ل٥٠

فەرهەنگەدا هەبووە . ئەوەتە مامۆستا خاڵ خۆی لەم بارەوە ئەڵێ :
« ئەوی لەم فەرهەنگە ورد ئەبێتەوە ئەبێ بزانێ کە تا ئێستا لەم ڕووەوە سەرمەشقێکمان بۆ دانەنراوە تا چاوی لێبکەین و فەرهەنگێکی تێکڕایمان بە زمانی کوردی بۆ نەنووسراوە تا لاسایی بکەینەوە .. »[٤].
بێگومان نەبوونی سەرچاوەو نووسراوێکی پێشوو لەم چەشنە بووە بە هۆی ئەوەی « فەرهەنگی خاڵ » دوور نەبێت لە چەند ناتەواوییەك .
بە کورتی لەو ناتەواوییانە ئەدوێین :

پێش ئەوەی بێینە سەر باسکردنی ناتەواوییەکانی ناوەرۆکی ئەم فەرهەنگە ، ئەمەوێت بە چەند دێڕێك لە پێشەکییەکەی بدوێم . هەرچەندە گرنگیی فەرهەنگەکە ناوەرۆکەکەیەتی ، بەڵام لەبەر ئەوەی زوربەی فەرهەنگنووسەکانمان لە پێشەکیی فەرهەنگەکانیاندا گەلێك شت ئەنووسن کە پەیوەندی نیە لەگەڵ مەبەستی فەرهەنگەکانیاندا ، وا ئەزانم ئەگەر بە کورتی لەم بەشە بدوێم لە کەڵك زیاتر زیان نادەم .

مامۆستا خاڵ لە لاپەڕە (٧ـ١٠)دا زۆر بە وردی باسی پێویستی و نرخی فەرهەنگ ئەکات بۆ مانەوەو پێشخستنی زمان .

لە لاپەڕە (١٠ـ١٥)دا بە کورتی باسی ئەو فەرهەنگە کوردیانە ئەکات ، کە لە پێش فەرهەنگەکەی ئەوەوە نووسراون . لێرەدا تەنها باسی حەوت فەرهەنگی کردووە : ( ئەحمەدی خانی ، ئەحمەدی ، یووسف ضیا پاشای خالیدی ، فەردیناند یووستی ، مێجەر سۆن ، ڕابەر ، مەردۆخ )[٥] . بەڵام گەلێك فەرهەنگیتر هەن ، وەك : ( گەرزۆنی ، لێرخ ، فۆسوم ، یەگیزارۆف ، جاردین ... هتد)[٦] و

---

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ١٦ .

(٥) ، (٦) لێکۆڵینەوە لەو فەرهەنگانە بە چەند وتارێکی تایبەتی پێشکەش ئەکەین .

باسی نەکردوون . دیارە ئـەم فەرھەنگانە بە دەست مامۆسـتا خاڵ نەگەیشتوون ، بەلاّم فەرھەنگی « کۆلکەزێڕینە »ی مامۆستا گیوی موکریانی ، کە ساڵی ١٩٥٥ دەرچووە ، لەو باوەڕەدام مامۆستا خاڵ لە یەکەم ڕۆژەوە چاوی پێ کەوتووە . لەبەر ئەوە ، کە هاتۆتە سەر باسی فەرھەنگە کوردییەکان ئەبوایە باسێکی « کۆلکەزێڕینە »شی هـەر بکردایە . جگە لەوە لەگەڵ باوەڕی مامۆستا خاڵدا نیم کـە ئەڵێ : « نەوبەهارو ئەحمەدیو ڕابەر لە عەرەبییەوەن بۆ کوردی ، واتـە فەرھەنگی عەرەبین نەك کوردی »[٧] . ڕاستە ئەم فەرھەنگانە لـە عەرەبییەوەن بۆ کوردی ، بەلاّم عەرەبیی ڕووت نین ، بەلکو ساماتێکی ئێجگار گەورەن لە مێژووی فەرھەنگ نووسیی کوردیداو هەروەها بۆ نووسینی فەرھەنگی کـوردی ــ کـوردی لە بەشە کوردییەکانیان ئەتوانرێ کەلکی باش وەربگیرێ ... لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا لـە فەرھەنگی کوردی کەم دواون ، ئەم باسەی مامۆستا خـاڵ کەلك و سوود دەگەیەنێ .

نووسەر لە لاپەڕە ( ١٧ــ٢٦ )دا چەند باسێکی کردووە ، وەك : پەیدابوونی وتەو زمان ؛ جیابوونەوەی زمانو وتەی زمان ؛ لقوپۆپی زمان ؛ کورد ؛ پێگەیشتنی زمانی کوردی ؛ جیابوونەوەی شـێوەی کوردی ؛ سنووری کوردستان ... ئەم باسانە زۆر پەیوەندییان لەگەڵ مەبەستی فەرھەنگ دانانندا نییەو ئەتوانرێ بکرێن بە سێ بەشەوە ؛ کە بەستراون بە سێ لقی زانستی جیاوازەوە : ١ــ مێژوو ؛ ٢ــ جوگرافیا ؛ ٣ــ زمان بەگشتی . لەو باوەڕەدام ئەم باسانە کـە نزیکەی ( ١٠ ) لاپەڕەیان داگیرکردووە لەناو فەرھەنگەکـەدا نەبووتایە باشتر بوو .

---

(٧) سـەرچاوەی ناوبراو ، « فەرھەنگی خاڵ » ، بەرگی یەکـەم ، ل ١٤ ــ ١٥ .

لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە ، کە ئەم باسانە ڕاست نین ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ، بڵێم ئەتوانرا لە جێگایەکی‌تردا بڵاوبکرانایەوە ، نەوەك لێرەدا باری فەرهەنگەکە گران بکەن • لە سەرێنکی‌کەوە لەو باوەڕەدام ، هۆی بڵاوکردنەوەی گەلێك باس لەناو فەرهەنگدا کە پەیوەندیان کەمە لەگەڵ کاری فەرهەنگدا ئەم دوو هۆیەن : یەکەم ـ لەبەر ئەوەی لە کوردەواریدا مەودای بڵاوکردنەوە هەردەم کەم بووە ، بۆیە فەرهەنگ‌نووسەکانمان لە ڕێگای پێشەکی‌یەکەیانەوە هەولیان‌داوە لە زۆر شت بدوێن • دووەم فەرهەنگ‌نووسەکانمان ویستوویانە زانین‌و تواناو ڕازی خۆیان بۆ گەلیان دەرخەن •

لە لاپەڕە ( ٣١ــ٣٨ )دا بە کورتی‌و ڕاست‌و جوان چەند زانیاریەکی پێویستی لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە داوە ، کە بەتەواوی لەگەڵ مەبەستی فەرهەنگەکەدا ئەگونجێ‌و بۆ گۆڕینی وشە بەپێی پێویست بەکارهێنەری فەرهەنگەکە ئەتوانێ سوودی لێ‌ببینێ • لەم بەشەدا چەند کەم‌وکورتییەکی بچووك هەیە ، وەك ئەوەی لە لاپەڕە ( ٢١ ــ ٣١ )دا باسی « پیتی کوردی‌و نووسینی کوردی »ی ئەکات‌و ئەمەی لە بەشی ڕێزمان جیاکردۆتەوە • بەڵام ئەبوایە ئەمەش هەر لەناو بەشی ڕێزمانەکەدا بووایە ، چونکە پێوەندیی ڕاستەوخۆی پێوە هەیە •• هەروەها چەند زاراوەیەکی داوە ، کە بە باوەڕی من زۆر لە جێگای خۆیاندا نین ، وەك بۆ جیاکردنەوەی پیتی ( ر ) ــ ( ڕ ) ، ( ل ) ــ ( ڵ ) هاتووە ( ر )ی ناوناوە بچووك‌و ( ڕ )ی ناوناوە گەورە • ( ل )ی ناوناوە سووك‌و ( ڵ )ی ناوناوە قەڵەو • هەرچەندە بچووك‌و گەورە تا ڕادەیەك ڕاستن ، بەڵام بە تەواوی ناگونجێن • خۆ سووك‌و قەڵەو هەر بە هیچ جۆرێك بە ڕاستی نازانم ، چونکە ئەم دوو وشەیە دوورن لە یەك ، بەڵام زۆر باش دەبوو ئەگەر مامۆستا لاوازو قەڵەو ، یا لەڕو قەڵەوی بەکاربهێنایە • هەروەها ئەتوانرێ نەرم‌و ڕەق بەکاربهێنرێ •

لـه لاپەڕە ( ٣٨ ـ ٣٩ )دا ئەو نیشـانانە ئەدات ، کـە لەناو فەرهەنگەکەدا بەکاری هێناوە . ئەو فەرهەنگانەی لە کوردستاندا تـا سالی ١٩٦٠ دەرچوون ئەم پێویستییەی تیایاندا باس نەکراوە ، تەنهـا مامۆستا خال بۆ یەکەم جار هەستی بەوە کردووەو بەمە کاری بەکارهێنانی فەرهەنگەکەی ئاسان کردووە .

بەگشتی ئەم فەرهەنگە لەسەر شێوەیەکی جوانو ڕاست دانراوە . گەلێك لەو گرانیی و زەحمەتیو ناتەواوییانەی لەناو فەرهەنگەکانی پێش ئەودا هەبوون ، مامۆستا خاڵ ئاسانی کردوونو پڕی کردوونەتەوە . دیـارە نووسەر خۆی زۆر لەگـەڵ نووسـینی فەرهەنگەکەیدا خەریك کردووە . هەروەها بۆ کۆکردنەوەی وشـەی کوردی زۆر گەڕاوەو خوێندنەوەی فەرهەنگەکەی ئەو ڕاستییە دەردەخاتو زوربەی وشەکانی زمانی کوردی بەرچاو ئەکەون .

بۆ لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی مانای وشە ، نووسەر چـەند ڕێگایەکی ڕاستی زانستی گرتووە . بۆ ئەو وشانەی بتوانرێ بە یەك وشە مانای نیشان بدرێ ، نیشانی داوە . وەك ( ئامشۆ ) بەرامبـەری نووسـیویتی ( هاتوچۆ ) ؛ بەرامبەر بە ( ئالۆشـدار ) نووسیویتی ( ئالۆشاوی ) ... هەروەها کـە هاتۆتە سەر وشەی ( هاتوچـۆ )و ( ئالۆشاوی ) بەجیا ڕاڤەی کردوون ، نەوەك یەکێك مانای ئەم وشانەش نێ نەگات . وەك وتمان ئەمە ڕێگایەکی ڕاستە ، بەلام ناتوانرێ لە هەموو شوێنێکدا بەکاربهێنرێ . چونکە لە هەندێ شوێندا ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی وشەیەك بە یەك وشە نادرێ ، وەك ئەبینین مامۆستا خاڵ بۆ مانای ( ئازادخوا ) وشەی ( ئازادخواه )ی داوە . لەو باوەڕەدام ، ئەگەر یەکێك لە ( ئازادخوا ) تێ نەگات ، ئەوە لە ( ئازادخواه )یش تێ ناگات ، بەلام مامۆسـتا مانای ئـەم دوو وشـەیەی بە ئالۆزی نەهێشتۆتەوە ، ئەویش بەوەی کە تۆرە هاتۆتە سەر وشەی (ئازادخواه)

ڕاڤەی کردووەو مانای کردۆتەوە • بەم جۆرە مانای ئەو دوو وشەیە ئاشکرابووە • لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ شوێنی کەمدا لەم بارەیەوە کەمو کوڕی هەیە ، وەك ئەبینین بۆ مانای ( ئاقدین ) بەرامبەری ( تۆلەسەندن )ی داوەو کەچی وشەی ( تۆلەسەندن ) بەجیا لە فەرهەنگەکەدا نییە • بۆ ( ئاگرپارێز ) بەرامبەری ( ئاگرپەرست )ی داوە ، بەڵام بەجیا وشەی ( ئاگرپەرست ) لە فەرهەنگەکەدا نییە ••• هتد • جگە لەوە هەندێ لەو وشانەی ماناکانیانی بەیەك وشە کردۆتەوە ، زۆر باش ناگونجێن • وەك بۆ دانی مانای ( باڵگرتن ) بەرامبەری ( فڕین )ی داوە • ڕاستە ئەم دوو وشەیە لەیەکەوە نزیکن و بۆ مانای یەکەمی ئەگونجێ ، بەڵام بۆ مانای دووەمی ئەم وشەیە جیاوازی هەیە • جیاوازییەکەش ئەوەیە کە ( فڕین ) مانایەکی گشتی هەیە • مانای تەواوی ( باڵگرتن ) بۆ مانای دووەمی نەك ( فڕین )ە بەگشتی ، بەڵکو ( فێربوونی فڕین )ە وەك چوون تازە چۆلەکە یان کۆتر ••• ( فێری فڕین ئەبن )و ئەڵێن : ( باڵیانگرت ) ••• بۆ مانای ( بڕیار ) بەرامبەری ( پەیمان ) نووسراوە • ئەم دوو وشەیە لە یەکەوە نزیکن ، بەڵام مانایان تا ڕادەیەك جیاوازە • بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە ، نەوەك کە ئەزانین بە عەرەبی ( بڕیار ) ــ ( قرار )ەو ( پەیمان ) ــ ( وعد )ە ، بەڵکو ئەگەر لە دوو ڕستەی کوردیدا ئەم دوو وشەیە بەکاربێنین ، ئەبینین کە مانایان یەك نییە :

چاوەڕوانی پەیمانم •••

بڕیاری ژمارە یەك •••

••• هتد •

زۆر وشە هەن کە خاوەنی یەك مانان ، وەك ( ئاڕوا ، ئارۆ ، ئەمڕۆ ، ئیمڕۆ ، ئیرۆ ) • لێرەدا مامۆستا خاڵ زۆر چاكو کورت ئەم چەند وشە خاوەن یەكمانایەی داوەو تەنها وشەی ( ئیمڕۆ )ی لەناویاندا

ڕاڤەکردووە ، لەبەر ئەوە ئەبوایە بەرامبەر بە هەریەکێك لەو وشانە بنووسرێ ( ئیمڕۆ ) تا گەر یەکێك لە ( ئیمڕۆ )ش نەگات تەماشای ( ئیمڕۆ ) بەجیا بکات تا ئەوسا بە ڕاڤەکەیدا مانای بۆ ساغ ببێتەوە • مامۆستا تا ڕادەیەك ئەمەی نەکردووە • ئەوەیە چووە بەرامبەر بە ( ئاڕوا ، ئارۆ ) نووسیویتی ( ئەمڕۆ ) ، ئەمەش بەکارهێنانی فەرهەنگەکە گران ئەکات ، بەلام بەرامبەر بە ( ئیرۆ ) نووسیویتی ( ئیمڕۆ )و لێرەدا هەلەی نەکردووە ••• هتد •

جگە لەوەی هەندێ وشە هەیە ؛ کە زۆر بەباشی ئەتوانرێ بە وشەیەك مانای بدرێ ، کەچی نووسەر هەرچەندە بە یەك وشە مانای داوە ، بەلام بەبێ کەلك لە چەند شوێنێکدا بە وشەی بەرامبەرەوە چووە وشەی ( شت )ی نووساندووە • وەك دەبینین بۆ مانای ( ئاخرەمین ) نووسیویتی ( دواترین شت ) • وابزانم زۆر بەباشی ئەتوانرا بنووسرێ ( دواترین )و ئەو ( شت )ە نەبێ • بۆ مانای ( باش ) بەرامبەری نووسیویتی ( شتی چاك ) • لێرەشدا باشتر بوو وشەی ( شتی ) نەبوایە ، چونکە لەم نموونانەدا دیارە کە وشەی ( شت ) ، نەوەك باشتر مانا ناکاتەوە ، بەلکو بەپێچەوانەشەوە سەر لە خوێنەر تێك ئەدا ، چونکە ( دواترین شت ) وا پیشان ئەدات کە ( دواترین ) هەر بۆ ( شت ) ئەبێت ، بەلام ( دواترین کەس )یش هەیەو ئەوسا خوێنەر وا تێ ئەگا کە (دواترین) هەر بۆ ( شت ) ئەبێتو بەس • هەروەها جگە لە ( شتی چاك ) خۆ ( کەسی چاك )یش هەیە ••• بە تێکڕایی مامۆستا خال ڕاڤەی وشەی زۆر باش کردووە • بۆ ڕاستیی ئەمە ڕاڤەی چەند وشەیەك نیشان ئەدەین :

( ئاواتە ) خواردنو بردنی شتی مەردوم بە خۆڕایی •

( ئۆقرەگرتن ) ئارامگرتنو داینبوون •

( ئەخترمە ) ولاخێکە لە جەنگا لە دوژمن گیرابێ •

( ئـارد ) هاڕاوی دانەوێڵە .
... هتـد .

بەم نموونانەدا بۆمان دەرئەکەوێ کە نووسەر لە ڕاڤەکردنی وشەدا هونەرێکی زۆر بەرزی پیشـانداوەو خوێنەر ئەتوانێ بەئاسانی لـە مەبەستو واتای وشە تێبگات . بەڵام بەداخەوە لە هەندێ شوێندا نووسەر بە جۆرێك وشە ڕاڤە ئەکات ، کە تێگەیشتن لیێ ئاڵۆزە[٨] یان باش مانای وشەکەی بۆ دەرناکەوێ . وەك :

( ئاسمان ) لای هەرە ژووررووی سەرت .

بۆ ڕاڤەی وشەی ( ئاسمان ) مامۆستا زۆر وشەی ئاسانی باشی بەکارهێناوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مانای ( ئاسمان ) بەم ڕاڤـەیە هیچ ئاشکرانەبووە . جگە لەوەش خۆ گەر مەردوم لە ژووردا بێت ، ئەوە لای هەرە ژووررووی سەری بنمیچە ...

( ئیمڕۆ ) ئەو ڕۆژەیە کە تۆی تیایت .

بـەم ڕاڤەیە باش مانای وشەی ( ئیمڕۆ ) نەکراوەتەوە ، چونکە ئـەم ڕاڤەیە جگە لـە مانای سـەرەکی بە مانای ( ئەم دەمە ، ئـەم چەرخە ... )یش دێت .

( ئاواتەچی ) کەسێکە کە شتی مەردوم بخوا یا ببیا بە ئاواتە .

وەك لەسەرەوە وتمان ، ڕاڤەی وشەی ( ئاواتە )ی باش کردووە ، بەڵام ڕاڤەی وشەی ( ئاواتەچی ) ئەو ناتەواوییەی هەیە ، کە نووسەر لە کۆتایی ڕاڤەکەدا چووە وشەی ( ئاواتە )ی بەکارهێناوە . باشتر

---

(٨) ئەگەر ڕاڤەکان بۆ زۆر کەس ئاڵۆز نەبن ، مانای ئەوە نییـە ڕاڤەکان ئاسانن ، بەڵکو ئەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە فەرهەنگ بۆ هەموانە .

وابوو ( خـۆڕایی ) بەکاربهێنێ ، چونکە ئەگەر یەکێك لـە وشەی ( ئاواتەچی ) نەگات ، ئەوە دوور نییە لە ( ئاواتە )یش تێنەگات .

( ئاسان ) کاری سووکی بێ گیروگرفت .

هیچ مەرج نییە کە کاری ئاسانو سووك بێ گیروگرفت بێت . زۆر ڕێ ئەکەوێ کارێك سووکە ، بەڵام گیروگرفتی زۆرە .

( ئاوەڵزاوا ) مێردی خوشکی ژن .

گەر یەکێك مانای ئەم وشەیە نەزانێ ، ئەوە بە ڕاڤەکەیدا هیچی بۆ ڕوون نابێتەوە .

جگە لەوەی کە ڕاڤەی هەندێك وشە ئالۆزن یا نارێکنو کەمێ هەڵەیان تیادایەو کەموکوڕی‌یەکیش هەیە لەوەی کە ئەبوو زوربەی وشەکان بخرانایە ناو ڕستەیەکی کورتی ئاسانەوە تا مانای وشەکان باشتر ئاشکرا ببوونایەو خوێنەر لەو ڕێگایەوە بیزانیایە چۆن ئـەو وشانە لە ڕستەدا بەکارئەهێنرێن وەك بۆ وشەی ( ئاسمان ) ئەتوانرا بنووسرێ ( بە ئاسـمانەوە ئەسـتێرەم دیوە ... ) . بۆ ( ئیمـڕۆ ) بنووسرێ ( ئیمڕۆ یەکەم ڕۆژی هاوینە ... ) ... هتد .

لێرەدا دیارە کە چۆن لە ڕستەدا مانای وشە ڕوونئەبێتەوە و چۆن ڕستە بەکارهێنانی وشە پیشانئەدا ... لەم ڕووەوە مامۆستا خاڵ بە تەواوێ ئەم ڕێبازەی نەگرتووە . ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کـە نووسەر یەکجار دوورە لەم جۆرە شێوازەوە ، بەڵکو لە هەندێ شوێندا ئـەم ڕێگایەی گرتووە ، بەڵام بۆ بەشێکی ئێجگار کەم لە وشەکان . وەك :

( ئاخریی ) ئەم ئەویست بچم بەڵام ئاخریی هەر چووم .

( پیرەوەری ) بە پیرەوەری من بەفری وەك ئەمساڵ نەباریوە .

بێ گومان پێویست ناکات هەموو وشەیەك بخرێتە ناو ڕستەوە ، چونکە زۆر وشە هەن کە ئاسانن‌و زۆر بەسەر زاری مەردومەوەن ، یاخود کردنەوەی مانایان ئاسانەو بەبێ ڕستە ئاشکرایە .

لە هەموو زمانێکدا وشە هەن کە تەنها یەك مانایان هەیەو وشەش هەن کە مانایان زۆرە . هەروەها لە زمانی کوردیدا ، وەك : ( شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ... هتد ) ئەبینین ئەم وشانە یەك مانایان هەیە . بەڵام وشە هەن ، کە پتر لە یەك مانایان هەیەو ئەو مانایانەش لە یەك نزیکن . وەك : ( بەردانەوە ، با ، بازاڕی ، بانگ ... هتد ) . ئەگەر تەماشای « فەرهەنگی خاڵ » بکەین ، ئەبینین ڕاڤەی هەموو ماناکانی ئەم وشانە هەن ، بەڵام ئەوەی ناتەواوی بێ لەم بەشەدا ، ئەوەیە کە مامۆستا ئەم مانایانەی بە خاڵێك لێك جیاکردۆتەوە . وا بۆ نموونە وشەی ( بەردانەوە ) پیشان ئەدەم ، کە چۆنە لە فەرهەنگەکەدا :

( بەردانەوە ) بەردانی ئاوی گیراو . فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە .

لێرەدا باش ئاشکرایە ، کە وشەی ( بەردانەوە ) دوو مانای هەیەو هەردوو ماناکە لێك نزیکن‌و نووسەر ڕاڤەی هەردوو ماناکەی کردووە . هەرچەندە مامۆستا لە پێشەکیدا لە لاپەڕە ( ٣٨ — ٣٩ )دا باسی کردووە گەر لە ناوەندی ڕاڤەکاندا ( . ) دانرا ئەوە مەبەستێکی ترە ، بەڵام باشتر بوو مەبەستەکان بە ژمارە ١ ، ٢ ، ٣ ... جیابکرانایەوە . ئەمە بۆ ئەوەی خوێنەر زوو هەست بەو جیاوازییە بکات ، چونکە دوور نییە زۆر کەس فەرهەنگەکە بەکاربهێنن‌و پێشەکییەکەیان نەخوێندبێتەوە . هەروەها ئەم ڕێگایەش ئەو ڕێگایەیە کە فەرهەنگ‌نووسەکانی هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکان لەسەری ئەڕۆن . لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا لە چەند نموونێکدا بەم جۆرەی کە من نیشانم‌داوە هەر بەو جۆرە

کردوویەتی • وەك چۆن بۆ وشەی ( بۆ ) جوان ماناکانی دابەش کردووە بەسەر یانزە بەشداو تێکەڵاوی نەکردووە •

ڕاڤەی هەردوو ماناکەی وشەی ( بەردانەوە ) کــە لەسەرەوە پیشانم دا چۆن لە « فەرهەنگی خاڵ »دا بە ( • ) جیاکراوەتەوە ، باشتر وا بوو لەسەر ئەو شێوەیەی خوارەوە بوایە :

( بەردانەوە ) ١ــ بەردانی ئاوی گیراو ؛ ٢ــ فڕێدانی شــتێك لــە بەرزی یەوە •

چۆن وشە هەن خاوەنی چەند مانایەکی نزیکن ، هەروەها وشەش هەن ، کە خاوەنی چەند مانایەکی دوورو جیاوازن • وەك :

( ئازار ) ئێشی ئەندام • مانگی مارت کە سی و یەك ڕۆژە •

( باقە ) چەپکێك لــە گیا یا لــە گوڵ • دەنگێکە وەك دەنگی بزنو ڕێوی •

( بــاو ) دەستوور : فیسار شت بووە بە باو • باوك • زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا : ئەم کۆمەڵە گەنمە باوی هەیە بەسەر ئــەو کۆمەڵەدا ، یا نەریمان لە زیرەکیدا ( باو )ی بەسەر سالاردا هەیە ، واتە لــەو زیاترە •

••• هتــد •

وەك ئەبینین ، ڕاڤەی ئەو وشانەی کە مانایان جیاوازنو لــەیەك دوورن ، دیسان هەر بە نیشانەی ( • ) لە یەکتر جیاکراونەتەوە • ئەگەر بۆ ئەو وشانەی چەند مانایەکیان هەیەو ماناکانیان لەیەك نزیکن ، ئەم نیشانەیە باش نەگونجێ ، ئەوە بۆ ئەو وشانەی چەند مانایەکیان هەیەو ماناکانیان لەیەك دوورن ، بە هیــچ جۆرێك ناگــونجێ ، چونکە ئەم کۆمەڵە وشانە تەنها ئەوەیە کــە بە نووسینو خوێندنەوە لــە یەکەوە

نزیکن ، ئەگینا بە ماناو پەیدابوونیان جیاوازی زۆرە لە نێوانیاندا •
وەك ( ئازار ) ــ ئێشی ئەندام ، کە وشەیەکی کوردی‌یە زۆر دوورە لە
( ئازار ) ــ مانگی مارت ، کە وشەیەکی کوردی نییەو لە پەیدابوونو
دروستبووندا سەرچاوەیەکی کەی هەیە • یاخود وشەی ( بــاو ) ــ
ئەبینین کە سێ مانای جیاوازی هەیەو هیچیان لەیەك ناچنو دوورن لە
یەکتر • هەر سێ وشەکە کوردین ، بەلاّم پەیدابوونو دروستبوونیان
لە رێگای جیاوازەوە هاتووە • بۆ ئەم جۆرە وشانە ئەبوایە وەك لای
خوارەوە چۆن پیشانی ئەدەم وەها جیابکرانایەوە :

( ئازار )[1] ئێشی ئەندام •
( ئازار )[2] مانگی مارت •••

( باقــە )[1] چەپکێك لە گیا یا لە گوڵ •
( باقــە )[2] دەنگێکە وەك دەنگی بزنو رێوی •

( بــاو )[1] دەستوور : فلاّن شت بووە بە باو •
( بــاو )[2] باوك •
( بــاو )[3] زیادەی شتێك بەسەر شتێکی‌تردا •••

مەرج نییە وەك من لە سەرەوە چۆنم پیشانداوە ئەبێ هەر وا
بێت ، بەلکو شێوەی کەش هەیە • وەك بۆ ئەو وشانەی کە ماناکانیان
لەیەك نزیکن لە باتی ۱ ، ۲ ، ••• ئەتوانرێ أ ، ب ، ج ••• دابنرێ •
بۆ ئەو وشانەی کە ماناکانیان لەیەك دوورن لەجیاتی ۱ ، ۲ ، ۳ •••
لەبەرزدەمی وشەکاندا ئەتوانرێ I ، II ، III ••• دابنرێ • بــۆ
کۆمەڵی یەکەمیان ئەبێ هەموو ماناکان یەك لە دوای یەك بنووسرێنو
چ بە ژمارە ، چ بە پیت جیابکرێنەوە • بۆ کۆمەڵی دووەمیان ئەبێ
چەند مانای جیاوازی هەیە ، ئەوەندە جار ئەو وشەیە سەرلەنوێ لــە
سەری دێڕ بنووسرێتەوەو وەك وشەیەکی نوێ مامەڵەی لەگەڵ بکرێ •

هەرچەندە چەند ناتەواویو کەموکورتییەکی کەم لە « فەرهەنگی خاڵ »دا هەیە ، بەڵام ئەو ناتەواوییانە بە جۆرێك نین کە لە نرخی فەرهەنگەکە کەم بکەنەوە . بەگشتی « فەرهەنگی خاڵ » فەرهەنگێکی سەرکەوتووەو کارێکی گەورەو گرنگو پێویستە ، بەرهەمی ڕەنجی چەند ساڵەی مامۆستا خاڵە لە نواندنی هونەرێکی بەرز لە دانانی یەکەم فەرهەنگ لە کوردییەوە بۆ کوردی . ئەم فەرهەنگە گەنجینەیەکی فراوانی زمانەکەمانە .

چ لەبارەی نووسینی فەرهەنگەوە یا لە بارەی بەکارهێنانو سوودلێبینینەوە ، چ لەبارەی زانستی فەرهەنگنووسیی کوردییەوە یا لە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا ، ئەم فەرهەنگە دەورێکی گەورەی بینیوەو ئەبینێ . ئەم فەرهەنگە سەرچاوەیەکی ئێجگار گەورەیە بۆ نووسینی گەلێك فەرهەنگی هەمەچەشنە ، وەك لە کوردییەوە بۆ زمانێکی بێگانە یان بەپێچەوانەوە لە زمانێکی بێگانەوە بۆ کوردی ... هتد .

ئیتر سوپاس ، هەزاران سوپاس بۆ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ کە ئاواتی چەند ساڵەی گەلی کوردمانی هێنایە دی(*) .

---

(*) ئەم وتارە لە ژمارە ( ١٩ )و ( ٢٠ )و( ٢١ )و ( ٢٢ )ی ساڵی ١٩٧١ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا بڵاوکراوەتەوە .

# چەند ڕوونکردنەوەو بەڵگەو تێبینی‌یەکی نوێ دەربارەی (( فەرهەنگی خاڵ ))

مەبەستی ئەم وتارە گەیشتنە ئەنجامە لە لێکۆڵینەوەی « فەرهەنگی خاڵ »دا لە ڕێگای خزمەت‌کردنی زمانی کوردی‌دا بەگشتی‌و کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا بەتایبەتی .

لە ژمارە ( ١٩ ، ٢٠ ، ٢١ ، ٢٢ )ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا دەربارەی « فەرهەنگی خاڵ » زنجیرەیەك وتارم بڵاوکردەوە ، کە بریتی بوو لە سەرنجێکی سەرپێ‌یی‌و لێکۆلینەوەیەکی کورت لە فەرهەنگی ناوبراو .

ماوەیەك لەمەوبەر نووسەری ئەم فەرهەنگە ــ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ــ لەژێر ناوی « وەرامی ڕەخنەگر لەسەر فەرهەنگی خاڵ »دا[1] دەربارەی وتارەکەی من بیروباوەڕی خۆی دەربڕیبوو . هەرچەندە وەرامەکانی بیروڕای منیان نەگۆڕی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێزی بیروباوەڕی مامۆستا خاڵ دەگرم‌و سوپاسی دەکەم‌و بەتایبەتی جێگای شانازی‌یە ، کە مامۆستا هێندە باوەڕی بە لاوانی خوێندەواری کورد هەیە .

(١) بڕوانە : ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ژ ٣٥ ، ل ٦ ، ژ ٣٦ ، ل ٦ ــ ٧ .

ئەوەی ڕایکێشام بۆ ئەوەی جارێکی‌تر بکەومە لێکـۆڵینەوەو ڕوونکرنەوەی ئەو تێبینی‌و سەرنجانەی دەربارەی « فەرهەنگی خاڵ » هەمە ، ئەوە نییە ، کە باوەڕم لەگەڵ وەڵامەکانی مامۆستادا ناگونجێ ، یاخود هەر بمەوێ وەڵامی بدەمەوە ... نەخێر ، بەڵکو لەوە گەلێك بەرزترەو هەستێکی گەلێك پاکم هەیە . هەست بە دواکەوتوویی کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردی دەکەم‌و وەك کوردێکی دڵسۆز ئەمـەوێ ئەرکی سەرشانم بەجێ‌بهێنم . ئەویش بەوەی لە ڕێگای زمانەوانییەوە ئەوەی لە توانامدا هەیە بینووسم بۆ گشت خوێندەوارانی کورد ، نەك تەنها بۆ مامۆستا خاڵ ، چونکە ئەگەر تەنها بۆ مامۆستا خاڵ بوایە ، ئەوە بە نامە بیروڕای خۆمم بۆ ئەنووسی .

بۆ پێشخستنی ئەم زانســـتە وا جارێکی‌تر لەســـەر بنچینەی وەڵامەکانی مامۆستا خاڵ‌و ڕوونکردنەوەو بەڵگەو تێبینی نوێ ئەکەومە شی‌کردنەوەی « فەرهەنگی خاڵ » . تا ئەگەر گیروگرفتێـك هەبێت چارەسەر بکرێ‌و ئەگەر ئاڵۆزی‌یەك هەبێ خاوبکرێتەوە .

مامۆستا خاڵ بەر لەوەی بێتە سەر وەڵام‌دانەوە ، ئەڵێ : « کاك ئەوڕەحمان بەناوی ڕەخنەوە هێندێ شتی پێش‌چاو خستووە ، لـــە فەرهەنگەکەدا . هەرچەندە شتەکان گرنگ نین ... »[۲] . بێ‌گومان منیش بە هەموو بیروباوەڕمەوە لەگــەڵ مامۆســـتادام‌و ئەو چــەند کەم‌وکوڕی‌یەی خستوومەتە پێش‌چاو گرنگ نین‌و لە نرخی فەرهەنگەکە کەم ناکەنەوە ، بەڵام خۆ من وەنەبێ پاش وەڵامەکەی مامۆستا هاتبمە سەر ئەم باوەڕە ، بەڵکو لـە وتارەکەمدا لـە چەند شوێنێکدا ئەمەم دووپات‌کردۆتەوە . یەکێـك لەو شوێنانە ئەوەیە ، کـە لـە کۆتایی وتارەکەمدا نووسیومە : « هەرچەندە چەند ناتەواوی‌و کەم‌وکورتییەکی

---

(۲) هەمان سەرچاوە ، ژ ۳۵ ، ل ٦ .

کەم لە ( فەرهەنگی خاڵ )دا هەیە : بەڵام ئەو ناتەواوییانە بە جۆرێك نین کە لە نرخی فەرهەنگەکە کەم بکەنەوە . بەگشتی (فەرهەنگی خاڵ ) فەرهەنگێکی سەر کەوتووەو کارێکی گەورەو گرنگ‌و پێویستە »[٣] .

لە وتارەکەمدا وتوومە : ئەو چەند باسەی لە سەرەتای ( فەرهەنگی خاڵ )دا نووسراون ، وەك : جیابوونەوەی زمان ؛ زمان‌و وتەی گەلان ... کورد ... سنووری کوردستان ... زۆر پەیوەندییان لەگەڵ فەرهەنگدا نییەو لەناو فەرهەنگەکەدا نەبوونایە باشتر بوو ...

بەڵام مامۆستا خاڵ ئەڵێ : « ئەم باسانە هەموو دەست‌و پێوەند عەلاقەمەندی فەرهەنگن‌و هەر یەکێکیان کلاورۆژنەیەکە بۆ خوێندەوارانی بەڕێز ... »[٤] . هەرچەندە چەند بەڵگەو ڕوونکردنەوەیەك هەیە بۆ نیشاندانی ئەوەی ، کە پێویست ناکا بەم جۆرە باسانە باری فەرهەنگ گران بکرێ ، بەڵام من لێرەدا درێژەی پێنادەم‌و تەنها ئەوە ئەڵێم کە مامۆستا خاڵ هەر خۆشی نووسیویتی : « تێناگەم ڕەخنەگر پەیوەندی بەلاوە چییە »[٥] . جا منیش تێناگەم چۆن شتی بەلا پەیوەندی هەیە بە فەرهەنگەوەو چۆن کلاورۆژنەیە ؟..

من لە وتارەکەمدا نووسیومە : ( ئاقدبین ) بە ( تۆلەسەندن ) ڕاقەکراوە ، کەچی ( تۆلەسەندن ) بەجیا لە فەرهەنگەکەدا نییە . هەروەها ( ئاگرپارێز ) بە ( ئاگرپەرست ) ڕاقەکراوە ، بەڵام وشەی ( ئاگرپەرست ) بەجیا لە فەرهەنگەکەدا نییە ..

وەڵامی مامۆستا خاڵ ئەمەیە : « چونکە ( تۆلەسەندن )و ( ئاگرپەرست ) وشە نین تا ڕاقەبکرێن ، بەڵکو ڕستە ( جملە )ن ، وە

---

(٣) هەمان سەرچاوە ، ژ ٢٢ ، ل ٦ .
(٤) هەمان سەرچاوە ، ژ ٢٥ ، ل ٦ .
(٥) هەمان سەرچاوە ، ژ ٢٥ ، ل ٦ .

( تۆلە )و ( سەندن )و ( ئاگر )و ( پەرستن ) هەر یەکە جیاجیا لە شوێنی خۆیاندا ڕاقەکراون »[٦] •

بێشك لە هەموان ئاشکرایە ، کە ( تۆلەسەندن )و ( ئاگرپەرست ) وشەن ، نەك ڕستە ، وەك مامۆستا خاڵ ناوی ناون • ئەمانە وشەی ( مرکب )ن‌و لە زمانی کوردیدا ئێجگار زۆرن • هەروەها ئەمە یەکێکە لەخاسیەتەکانی زمانی کوردی • وا بزانم پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات ، کە هەر یەك لەم دوو وشەیەی ناومان بردن چۆن دروستبوون ، چونکە شێوەی دروستبوونیان جوان دیارە •

مامۆستا خاڵ ئەو دوو وشە ( مرکب )ەی ناوناوە ڕستەو بەپێویستی نازانێ بکەونە ناو فەرهەنگەکەوەو بەجیا ڕاقەبکرێن • بەڵام سەیر ئەوەیە ، کە لە گشت لاپەڕەیەکی فەرهەنگەکەدا وشەی ( مرکب ) دەبینرێ • لە زۆرلاپەڕەدا نەك هەر دەبینرێ ، بەڵکو ئێجگار زۆریشە • بۆ نموونە ، ئەگەر تەماشای لاپەڕە ( ١٢ )ی بەرگی دووەمی فەرهەنگەکە بکەین ، دەبینین هەر ( ٢٩ ) وشەی ئەو لاپەڕەیە ( مرکب )ن • ئەگەر وابێ تێناگەم بۆچ فەرهەنگەکەی پڕە لەو وشە ( مرکب )انەی ، کە ئەو بە ( جملە )یان دائەنێ ؟

لە فەرهەنگەکەدا وشەی ( خواپەرست ) هەیەو ڕاقەکراوە ، کەچی وشەی ( ئاگرپەرست ) نییە • بەمەدا دەرئەکەوێ کە مامۆستا خاڵ ( ئاگرپەرست ) بە ڕستە دائەنێ‌و ( خواپەرست ) بە وشە • جا لە مامۆستا دەپرسم لە چۆنیەتی دروستبووندا ( نەك ماناد! ) جیاوازی لە نێوان ( ئاگرپەرست )و ( خواپەرست )دا چییە ؟•

یاخود ( تاوسەندن ، جۆشسەندن ••• ) لە فەرهەنگەکەدا هەیە ، کەچی ( تۆلەسەندن ) نییە • خۆ ئەم وشانەش لە چۆنیەتی دروستبووندا

(٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٥ ، ل ٦ •

وەك یەكن‌و بۆچ ئەوەی پەڕێنراوە ناوبنێ ڕستەو ئەوەی نووسراوە ناوبنێ وشە ٠ نازانم مامۆستا خاڵ ڕستە بەچی تێدەگات ؟٠

هەروەها ئەم وشـــانە : ( چاوپۆشین ، چاوپیاخشـــاندن ، چاولێقوچاندن ، چوارچاوكردن ، چوارچاوبوون ٠٠٠ )و گەلێكیتر ، كە وشەی ( مركب )ن لەناو فەرهەنگەكـەدا هەن‌و ڕاڤەش كراون ٠ هەندێ لەم وشانە نەك لە دوو وشە پێكهاتوون ، بەلكو لە سێ وشەش پێكهاتوون ٠ ئەگەر مامۆستا خاڵ ئەو وشە ( مركب )انەی لە دوو وشە پێكهاتوون ناوبنێ ڕستە ، ئەی ئەبێ ئەو وشە ( مركب )انەی لە سێ وشە پێكهاتوون چۆن ناوبنێ ؟٠

لە سەرەوە ڕوونمان‌كردەوە ، كە ڕاست نیيە بەو جـۆرە وشانە بوترێ ڕســـتە ، چونكە ئەوانە وشـــەی ( مركب )ن ٠ هەروەها ڕوونمان‌كردەوە ، كە وشەی ( مركب ) پێویستە لە فەرهەنگدا بنووسرێ‌و ڕاڤەبكرێ ٠ بێ‌گومان « فەرهەنگی خاڵ » پڕە لە وشەی ( مركب )و وا پێویستە ، بەلام چەند وشەیەك پەڕێنراوە ٠ ئەویش بە گـــوێرەی وەلامەكـــەی دانەر وا دەردەكەوێ ، ئەو چەند وشـــەیە بە ڕستە تێ‌گەیشتووە بۆیە پەڕاندوویەتی ٠

ڕەخنەم لەوە گرتبوو ، كە مامۆستا خاڵ لە ڕاڤەی ( ئـاڕۆ )و ( ئارۆ )دا ئەڵێ ( ئەمڕۆ ) ، لە ڕاڤەی ( ئەمڕۆ )شدا ئەڵێ ( ئیمڕۆ ) ، ئنجا ( ئیمڕۆ ) بە درێژی ڕاڤەدەكا ٠٠٠ ئەگەر یەكسەر هەمو ئـەو وشانەی بە ( ئیمڕۆ ) ڕاڤەبكردایەو لەپاشا ( ئیمڕۆ )شی بە تەواوی ڕاڤەبكردایە ، باشتربوو ٠٠٠ بەلام مامۆستا خاڵ لە وەلامدا ئەڵێ : بەو شێوەیە كردویەتی بۆ ئەوەی خوێندەوار بە شوێن هەموو وشـەكاندا بگەڕێ ٠٠٠ بە باوەڕی من ئەمە ڕێـگا درێژ ئەكاتەوەو تـا ڕادەیەك بەكارهێنانی فەرهەنگەكە گران ئەكات ٠ هەروەها ئەمە پێویست ناكات ،

چونکه بۆ ئەو مەبەستەی مامۆستا خاڵ فەرهەنگی تایبەتی هەیە کە پێی دەڵێن : ( Dictionary of Synonyms ) • جگە لەوە ،ئەگەر چاوێك بە « فەرهەنگی خاڵ »دا بخشێنین ، دەبینین مامۆستا خۆشی لە زوربەی شوێنندا بەو جۆرە کردوویەتی کە من وتوومە • ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەوەی ، ئەو ڕێگایەی من ناوم هێناوە ڕاسترە • ئیتر تێناگـــەم بۆچی مامۆستا خاڵ وا ئەڵێ ؟•

نووسیبووم : نووسەر « لە چەند شوێنێکدا بە وشەی بەرامبەرەوە چووە وشەی ( شت )ی نووساندووە • وەك دەبینین بۆ مانای (ئاخرەمین) نووسیوێتی ( دواترین شت ) • وابزانم زۆر بە باشی ئەتوانرا بنووسرێ ( دواترین )و ئەو ( شـــــت )ە نەبێ • بۆ مانای ( باش ) بەرامبـــەری نووسیوێتی ( شتی چاك ) • لێرەشدا باشتربوو وشەی ( شتی ) نەبوایە ، چونکە لەم نموونانەدا دیارە کە وشەی ( شــت ) ، نەوەك باشتر مانا ناکەنەوە ، بەڵکو بەپێچەوانەشەوە سەر لە خوێنەر تێكئەدا ، چونکە ( دواترین شت ) وا پیشـــــانئەدات کە ( دواترین ) هەر بۆ ( شت ) ئەبێت ، بەڵام ( دواترین کەس )یش هەیەو ئەوسا خوێنەر واتێئەگا کە ( دواترین ) هەر بۆ ( شت ) ئەبێتو بەس • هەروەها جگە لە ( شتی چاك ) خۆ ( کەسی چاك )یش هەیە ••• »[٧] •

وەڵامی مامۆستا خاڵ ئەمەیە : « بۆ زیادە ڕوونکردنەوە ئـــەو ( شت )ەی لێزیادکراوە »[٨] ••• « هەرچی هەبێ لـــە بوونەوەردا هەمـــوو شتن ، بە ئادەمیو گیانلەبەرو گـــژوگیاو دارو درەخـــتو کۆچكو بەردەوە »[٩] •

(٧) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٦ •

(٨) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٦ •

(٩) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٦ •

بێشك لەگەڵ باوەڕی مامۆستا خاڵ نیم کە ئەڵێ : « بۆ زیادە ڕوونکردنەوە ئەو ( شت )ەی لێ زیادکراوە » • دووبارەی ئەکەمەوە ، کە بێ ئەو ( شت )ە باشتربوو : یەك ــ لەبەر بوونی جیاوازی لە بەکارهێنانو مانای ( شت )و ( کەس )دا ؛ دوو ــ چونگە ، ئەگەر بەرامبەر وشەی ( باش ) بنووسرێ ( چاك ) ؛ ئەوە مەبەست ئەوەیە ؛ کە ئەو دوو وشەیە یەك مانایان هەیە یاخود مانایان لەیەکەوە نزیکە • هەروەها ئەمە بە خوێنەر ئەڵێ گەر لە وشەی ( چاك )یش تێنەگەی یان ئەگەر ئەتەوێ زیاتر بۆت ڕوونببێتەوە ، ئەوە بڕوانە ڕاڤەی وشەی ( چاك ) ، کە لە شوێنی خۆیدا ڕاڤەکراوە • ئیتر ئەو وشەی ( شت )ە بۆ بێکەڵك بنووسرێ •

هەروەها مامۆستا خاڵ ئەڵێ : « هەرچی ببێ لە بوونەوەرا هەموو شتێ ؛ بە ئادەمیو گیانلەبەرو گژوگیاو دارو درەختو کۆچكو بەردەوە ••• » • بێگومان وایە ، بەڵام مامۆستا خاڵ ئەوەی لەبیرکردووە کە لە بەکارهێنانو ماناو دەستووری زماندا وا نییەو جیاوازی هەیە • بۆ پێسەلماندنی ئەو جیاوازییە دوور ناڕۆمو ناکەومە لێکۆڵینەوە ، بەڵکو تەنها ڕاڤەی چەند وشەیەك نیشان ئەدەم کە لە « فەرهەنگی خاڵ »دا نووسراوە • ئەو ڕاڤانە ، کە مامۆستا خاڵ خۆی کردوونی نیشانی ئەو جیاوازییە ئەدەن ، کە لە وەڵامەکەیدا ددانی پێدانانێ •

دانەر وشەی ( چکاندن )ی بەم جۆرە ڕاڤەکردووە :

( چکاندن ) ڕواندنی شت •••

ئاشکرایە ، کە گیانلەبەر ناڕوێنرێ ، واتە لێرەدا ( شت ) بۆ مانای ( کەس ) ناتوانرێ بەکاربهێنرێ • جگە لە گیانلەبەر ، بەردو •••یش ناڕوێنرێ • جا ئەگەر نووسەر بۆ ڕوونکردنەوە وشەی ( شت )ی

لەگەڵ ( ڕواندن )دا داناوە ، ئەوە ئەو ڕوونکردنەوەیە سەر لە خوێنەر تێك ئەدا . ئەگەر مەبەست ڕوونکردنەوە بوایە ، ئەوە لەجیاتی ( ڕواندنی شت ) باشتر وابوو بنووسرێ ( ڕواندنی دارو درەختو ... ) .

وشەی ( چۆپیکێش )ی بەم جۆرە ڕاڤەکردووە :
( چۆپیکێش ) کەسێکە کە سەرچۆپی بکێشێ .

ئەگەر ( کەس ) بە هەموو مانایەك ( شت ) بێت ، ئەی بۆچی نووسەر لەجیاتی ( کەسێکە ) نەینووسیوە ( شتێکە ) . نەینووسیوە ، چونکە ( کەس ) سەرچۆپی ئەکێشێ ، نەك ( شت ) .

وشەی ( خاوکردنەوە )ی بەم جۆرە ڕاڤەکردووە :
( خاوکردنەوە ) ... بریتی‌یە لە خاوکردنەوەی یەکێك لە شتێك .

لە مامۆستا ئەپرسم : ئەگەر جیاوازی نییە ، بۆچی نەینووسیوە ( بریتی‌یە لە خاوکردنەوەی شتێك لە شتێك ؟ ) . بێگومان ناتوانرێ وا بووترێ ، چونکە جیاوازی هەیەو مانای ڕستەکە تێك ئەداتو ئەیگۆڕێ .

لە ڕاڤەی وشەی ( خواناس )دا ئەڵێ : « کەسێکە خوا باش بناسێو لە فەرمانی دەرنەچێ » . ئەگەر لێرەدا وشەی ( کەسێکە ) بکرێ بە ( شتێکە ) ، ئەوە ڕاڤەکە ئاڵۆز ئەبێ . جا ئەمە نیشانی جیاوازی ئەدات لەنێوان ( شت )و ( کەس )داو مامۆستاش لێرەدا هەستی پێ‌کردووەو بۆیە وای نووسیوە .

لەم جۆرە نموونانە هەر لە « فەرهەنگی خاڵ »ەوە دەتوانرێ بە سەدان بهێنرێتەوە . بەڵام لەو باوەڕەدام ، کە بەو چەند نموونەیەی سەرەوەدا دەرکەوت هەرچەندە گیانلەبەریش ( شت ) بێ ، بەڵام لە بەکارهێنانو ماناو دەستووری زماندا جیاوازی لە نێوان ( شت )و ( کەس )دا هەیە .

وا دیارە مامۆستا خاڵ ڕەخنەو ڕوونکردنەوەکی منی بەدڵ نییەو بۆیە بەم بۆنەیەوە نووسیویّتی : « ڕەخنەگر هەر بەمە وازی نەهێناوە ، بەڵکو پێشی لێهەڵبڕیوەو ئەڵێ : باشتر وابوو کە ئەو وشەی ( شت )ە نەبوایە ... »[10] .

ڕەخنە زۆرانبازیو قسەفڕێدان نییە . من زۆرم لە کەس نەکردووەو پێشم لێهەڵنەبڕیوە ، بەڵکو بیروڕای خۆمم دەربڕیوە . نازانم چۆن مامۆستا خاڵ دەربڕینی بیروباوەڕ بە وازنەهێنانو پێلێهەڵبڕین دائەنێ ؟. من لە وتارەکەمدا پتر باسی باشیی « فەرهەنگی خاڵ »م کردووە ، وەك لە ناتەواوی . ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی ڕووە باشەکەی هێندە بەنرخە ، کەموکوڕی شاردۆتەوە . جا دوور نییە بە ڕێکەوت یەکێك ڕووە باشەکەی نەبینێو بلێ : ڕەخنەگر بە خۆڕایی هێندە بە شانوباڵی فەرهەنگەکەدا هاتووە . بێ گومان نە ئەم باوەڕەو نە ئەو باوەڕەی مامۆستا خاڵ لە واقیعەوە نزیك نین ، چونکە من کۆلیومەتەوە ، نەوەك بە خۆڕایی بە شانوباڵدا هەڵم دابێ یان بە خۆڕاییو زۆرداری هێرشم بردبێ . ئەگەر مامۆستا خاڵ بەوردی بە وتارەکەمدا بگەڕێ یەك وشەی ڕەق چییە تێیدا نادۆزێتەوە . جا لەو باوەڕەدام ، ئەو جۆرە وشانە تەنها لە نرخی نووسین کەمئەکەنەوە .

من ڕەخنەم گرتبوو لە ڕاڤەی ( ئاسمان ) کە نووسراوە ( لای هەرە ژووروویی سەرت ) ، چونکە مانای ( ئاسمان ) بەم ڕاڤەیە باش ئاشکرا نەبووەو ئەگەر مەردوم لە ژوورابێ ، ئەوە لای هەرە ژووروویی سەری ، بنمیچە . بەڵام مامۆستا خاڵ ئەڵێ : « بنمیچ لای هەرە ژووروو نییە ، بەڵکو لای ژووروویی سەرە . لای هەرە ژووروو هەورو ڕۆژو مانگو ئەستێرەن ... »[11] و بۆ نیشاندانی ئەمە دوو ئایەتی هێناوەتەوە .

---

(10) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٦ .
(11) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٦ .

من لێرەدا سەرلەنوێ درێژەی پێنادەم ، بەڵکو بۆ پێسەلماندن دەپرسم :
ئەگەر بنمیچ لای ژووروویی سەرەو هەورو ڕۆژو ••• یش لای هەرە ژووروویی سەرن ، کەواتە بۆچی لە ڕاڤەی وشەی (حەوا)دا نووسیویتی (لای ژووروویی سەر) ؟• ئایا ڕاڤەی ئەم وشەیە لەگەڵ ڕوونکردنەوەکەی مامۆستادا ئەگونجێ ؟• ئایا بەم ڕاڤەیە مانای ( ئاسمان )و ( حەوا ) باش ئاشکرابوو ؟ ئەی مامۆستا بۆ لەوە بێدەنگ بووە ، کە وتوومە باشتر وابوو ئەم وشانە بخرێتە ناو ڕستەیەکی کورتەوە تا خوێنەر باشتر مانای بۆ ئاشکرا بێ‌و لەو ڕێگەیەشەوە بزانێ چۆن ئەو وشانە لە ڕستەدا بەکارئەهێنرێن ؟•

ڕەخنەم گرتبوو لەوەی « فەرهەنگی خاڵ » لە ڕاڤەی ( ئیمڕۆ )دا ئەڵێ : « ئەو ڕۆژەیە کە تۆی تیایت » • چونکە ئەم وشەیە جگە لە مانای ( حقیقی ) مانای ( مجازی )یشی هەیە ( ئەم دەمە ، ئەم چەرخە ••• ) • مامۆستا خاڵ لە وەڵامدا ئەڵێ : « فەرهەنگی خاڵ تەنها مانای ( حقیقی ) ئەدات‌و مانای ( مجازی ) نادات ، چونکە هیچ فەرهەنگێکی عەرەبی بە ( لسان العرب )و ( قاموسی محیطی فەیروز ئابادی )و ( صحاحی جوهری )و ( بحر المحیط )و ( قطر المحیط )و ( منجد ) •••ەوە مانای مەجازی‌یان نەنووسیوە » •

بێگومان سوود وەرگرتن لەو فەرهەنگە عەرەبی‌یانەو لە هەموو سەرچاوەیەکی عەرەبی زۆر پێویستە ، بەڵام سوودوەرگرتن نابێ ببێ بە خۆبەستن پێ‌یانەوە یاخود ڕاست نییە بوترێ : ئەگەر فەرهەنگی عەرەبی مانای ( مجازی ) نەدات ئیتر ئەبێ فەرهەنگی کوردیش نەیدات ••• ئەگەر ئاورێك لە فەرهەنگەکانی ( فەرەنسایی‌و ڕووسی‌و ئینگلیزی‌و ئەڵەمانی‌و ••• ) بدەینەوە ، دەبینین تێکڕایان مانای ( مجازی )یان نووسیوە • ئەو فەرهەنگانەی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان

دەنووسرێن هەموو مانای (مجازی) دەدەن ، جگە لە چەند فەرهەنگێکی بچووك نەبێت ، کە لە توانایاندا نەبووە • جا « فەرهەنگی خاڵ » ، کە فەرهەنگێکی گەورەی کوردی‌یە ، پێویست بوو مانای ( مجـــازی ) تێکڕای وشەکان بدات •

هەروەها ئەگەر تەماشـــای فەرهەنگی کوردی – ڕووسی چ• بەکایێڤ[12]و فەرهەنگی کوردی – ڕووسی ق • کـــوردو[13]و فەرهەنگی کوردی – ئینگلیزی تۆفیق وەهبی‌و ئەدمۆنس[14] ••• بکەین ، ئەوە دەبینین چۆن گرنگی‌یان بە مانای ( مجازی ) داوەو بەپێی توانا لە فەرهەنگەکانیاندا جێگەیان کردۆتەوە ••• جا ئەگەر مامۆستا خاڵ نایەوێ چاو لە زۆرِ فەرهەنگی فەرەنسایی‌و ئەڵەمانی‌و ڕووسی‌و ئینگلیزی ••• بکات ، ئەوە با چاو لەو فەرهەنگە کوردییانە بکات ، کە زانایانی کورد نووسیویانە •

ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ تەنها ئەوە نییە ، کە مامۆستا خاڵ لە سەرێکەوە مانای ( مجازی ) بە ڕاست‌و پێویست نازانێ ، بەڵکو ئەوەشە کە لە سەرێکی‌ترەوە لە فەرهەنگەکەیدا بۆ گەلێك وشە مانای (مجازی)ی نووسیوە • لە هەموو سەیرتر ، ئەوەیە بۆ وشەی ( چۆکدان ) نەك هەر مانای ( مجازی )ی نووسیوە ، بەڵکو مانا ( مجازی )یەکەی خستۆتە پێش مانا ( حقیقی )یەکەوە • ئەمە جگە لەوەی لەگەڵ باوەڕی دانەردا

---

(١٢) چەرکەزی بەکۆ ( باکایێڤ ) ، فەرهەنگی کوردی – ڕووسی ، مۆسـکۆ ، ١٩٥٧ .

(١٣) قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێڤ ) ، فەرهەنگی کوردی – ڕووسی ، مۆســـکۆ ، ١٩٦٠ .

(١٤) تۆفیق وەهبی‌و ئەدمۆنس ، فەرهەنگی کوردی – ئینگلیزی ، لەندەن ، ١٩٦٦ .

ناگونجێ ، هەروەها هەڵەشە ، چونکە لە فەرهەنگدا هەردەم مانای (مجازی) ئەبێ بکەوێتە کۆتایی ـ واتە پاش هەموو مانا (حقیقی)یەکان •

لەسەر ئەوەی لە ڕاڤەی ( ئاواتەچی )دا نووسراوە ( کەسێکە کە شتی مەردوم بخوا یا بیبا بە ئاواتە ) وتوومە : ناتەواویی ئەم ڕاڤەیە ئەوەیە کە لە کۆتاییدا وشەی ( ئاواتە ) بەکارهێنراوە • باشتر وابوو ( خۆڕایی ) بەکاربهێنرێ ، چونکە گەر یەکێك لە وشەی ( ئاواتەچی ) نەگات ، دوور نییە لە ( ئاواتە )ش نەگات • لە وەڵامدا مامۆستا خاڵ ئەلێ : « لە پێشی پێشەوە ڕاڤەی ( ئاواتە )ی کردووە بەو جۆرەی کە ڕەخنەگر ئەیەوێ ••• وە ئەم شێوەیە مەردوم ناچـــار ئەکا بە تەماشاکردنی گەلێ شتیتر » • بەڵام باوەڕی من ئەوەیە ، کـە ئەم شێوەیە ڕاڤە ئاڵۆز ئەکاو کاتیش بە خۆڕایی ئەبات ، چونکە گەر لــە ڕاڤەکەدا لەباتی ( ئاواتە ) بنووسرایە ( خۆڕایی ) ، ئەوە خوێنەر نەك هەر زووتر تێئەگەیشت ، بەڵکو بۆشی دەرئەکەوت ، کە ( خۆڕایی ) یانی ( ئاواتـــە ) • ئیتر بۆچ ئەبێ بچێ جـــارێکیتر بگەڕێ بۆ مانای ( ئاواتە ) لەکاتێکدا کە دەتوانرێ لە بەرامبەری هەمان مانا بنووسرێ • واتە لەیەك ڕاڤەدا بێ ئەملاوئەولا کردن مەبەستی نووسەر ئەهاتە دیو ئـەو ڕێگا دوورە کـــورت ئەکرایەوەو بەیەك بەردیش دوو نیشـــان ئەشـــــکێنرا •

« فەرهەنگی خاڵ » لە ڕاڤەی ( ئاوەڵزاوا )دا ئەلێ : « مێردی خوشکی ژن » • بە باوەڕی من ئەم ڕاڤەیە ئاڵۆزە ، بەڵام مامۆســـتا خاڵ لە وەڵامدا ئەلێ : « ئەمە بۆ یەکێك وایە کە کوردی نەزانێ ، یـــا شارەزای ئاهەنگی کوردی نەبێ ، ئەگینا یەکێك لە کوردی بگات چۆن لەم ڕاڤـــەیە ناگات ••• »[15] • بەلێ ڕاســـتە یەکێك کـــوردیزانو

(١٥) ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، ژ ٣٦ ، ل ٧ .

شارەزاییت ،نەك هەر لە ڕاڤەی ئەو وشەیە ئەگات ، بەڵکو بەبێ ڕاڤەو بەبێ « فەرهەنگی خاڵ »یش ئەو وشەیە ئەزانێو ماناکەشی لا ئاشکرایە .
هەروەها خۆ ئەوەی کوردیش باش نەزانێ ، ئەزانێ مانای ئەم وشانە : یەك ، دوو ، سێ ، شار ، ئاو ، بەرد ، پیاو ، ژن ، باوك ، دایك ، سێو ..
چییە . گەر وایە ، بۆچی مامۆستا خاڵ ڕاڤەی هەموو ئەم وشە ئاشکرایانەی کردووە ؟. جا با ئەوە لەبیر نەکەین ، کە فەرهەنگ بۆ زانایانو شارەزایانی زمان دانانرێت ، بەڵکو بۆ هەموانە . کوردێك یا بێگانەیەك کە فەرهەنگێکی کوردی بەکارئەهێنن ، بۆ ئەوەیە فێربن یان ئەگەر مانای وشەیەك نەزانن لەو فەرهەنگەدا بیدۆزنەوە ، نەك لەبەر ئەوەیە ، بیانەوێ بزانن دانەر ڕاڤەیوشەکا نی باش کردووە یان نا .

بێ گومان « فەرهەنگی خاڵ » بەگشتی ڕاڤەی وشەی بە شێوەیەکی ڕاستو ئاسان کردووە ، بەڵام لە چەند شوێنێکی کەمدا ئاڵۆزی هەیە .
نازانم بۆچ مامۆستا خاڵ نایەوێ ددان بەو کەموکورتییانەدا بنێ ؟. بۆ ئەمە لە وەڵامدا نووسیوێتی : « فەرهەنگی خاڵ لە ڕاڤەی هەموو وشەیەکا تێبینی ئەمەی کردووە ( ئاسانیی ڕاڤە ــ ئەوڕەحمان ) »[١٦]و بۆ پێسەلماندنی ئەم باوەڕەی ڕاڤەی وشەی ( بارگیر )ی نووسیوە بێئەوەی ناوی بارگیر بهێنێو ئینجا ئەڵێ : « با بزانین خوێندەوار هەیە نەزانێ ئەوە چییە »[١٧] .

وەك وتم ، دووبارەی ئەکەمەوە کە « فەرهەنگی خاڵ » گرنگی بە ئاسانیی ڕاڤە داوە . هەروەها ئەوەش دووبارە ئەکەمەوە ، کە لەو بارەوە کەموکوڕی هەیەو ناتوانرێ بووترێ هەموو وشەکان باش ڕاڤەکراون . ڕاستە ، ئەو نموونەیەی مامۆستا هێناویەتییەوە نیشانی

---

(١٦) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٧ .

(١٧) هەمان سەرچاوە ، ژ ٣٦ ، ل ٧ .

ئاسانیو جوانی ڕاڤەکردن ئەدات ، وا منیش بۆ نیشاندانی ئەوەی ، کە کەموکوڕی لە ڕاڤەی هەندێ وشەدا هەیە ، لەجیاتی یەك نموونە چەند نموونەیەك ئەهێنمەوە :

« فەرهەنگی خاڵ » لە ڕاڤەی ( سەگ )دا ئەڵێ :

« گیاندارێکی چوارپێی دڕە » .

لەو باوەڕەدام ، ئەگەر یەکێك خۆی مانای وشەی ( سەگ ) نەزانێ ، ئەوە بەو ڕاڤەیەدا هیچی بۆ ئاشکرا نابێت . تا ڕادەیەك لە مەتەڵ ئەچێت ، بەڵکو وەك مەتەڵێکی ئاڵۆزیش ، چونکە وەنەبێ هەر ( سەگ ) گیاندارێکی چوارپێی دڕ بێت ، بەڵکو ( گورگ ، شێر ، پڵنگ ... هتد )یش چوارپێشنو دڕیشن . جا چۆن بزانرێ ئەو گیاندارە چوارپێ دڕە کامەیە ؟ پێویست بوو ئەو ئاڵۆزییە خاوبکرێتەوە .

لە ڕاڤەی وشەی ( داربڕ )دا ئەڵێ : « گیاندارێکی بچکۆلەیە لە دڕندە » .

ڕاستە من ئەزانم ( داربڕ ) چی گیاندارێکە . بەڵام ئەگەر نەیزانم یان ئەگەر وشەی ( داربڕ ) نەنووسرێتو تەنها تەماشای ڕاڤەکەی بکەم ، ئەوە ئەبێ گشت گیاندارانی بچکۆلەی دڕندە بهێنمە بەرچاوم . هێنانە پێشچاو ئاسانە ، بەڵام چۆن بزانم کام دڕەندەیان وەڵامی ئەومەتەڵەیە .

نووسەر لە ڕاڤەی (حەمزەك)دا ئەڵێ : « جۆرە خواردەمەنیەکە » .

ئەم ڕاڤەیە لە مەتەڵ گراترە ، چونکە مەتەڵ هیچ نەبوایە ئەیووت ئەو خواردەمەنیە شیرینە یا ترشە یا شلە ... جا خواردەمەنی ئێجگار زۆرەو گەر یەکێك خۆی مانای وشەی ( حەمزەك ) نەزانێ ، ئەوە بەو ڕاڤەیەدا هیچی بۆ ئاشکرا نابێ .

مامۆستا خاڵ لە ڕاڤەی ( حەندەگو )دا ئەڵێ : « ناوی جۆرە گیایەکە » .

گیا جۆری زۆره • جا چۆن بۆ یەکێك گــەر کوردی باشیش بزانێو بە ڕیکەوت ناوی ئەم گیایەی بەرچاو نەکەوتبێ ، ئاشکرا ببێ ، ئەو گیایە چییەو چۆنە • هەروەها نووسەر لە ڕاقەی وشەی (شاوەنە)شدا ئەڵێ : « جۆرە گیایەکە » • پێویست بوو ڕوونیبکاتەوەو نەك بەو شێوە نائاشکرایە ڕاقەی ئەوو شانە بهێڵێتەوە •

لە ڕاقەی ( خرندال )دا ئەڵێ : « جۆرە گیایەکە ئەخوری » •

لە ڕاقەی ( خورشیدی )دا ئەڵێ : « جۆرە گۆرانییەکی خۆشی کوردییە » •

لە ڕاقەی ( بزن )دا ئەڵێ : « جۆرێکە لە ئاژەڵی ماڵی » •

••• هتــد •

وا بزانم زیاتر پێویست بە ڕوونکردنەوەو هێنانەوەی نموونەیتر ناکات • بەو نموونانەی سەرەوەدا ئاشــکرا دیارە ، کە هەندێ لــە ڕاقەکان ناتەواونو مانای وشەکانیان نەکردۆتەوە • دەبوو ئەو ڕاقانە بەو ئاڵۆزییە نەهێڵرێنەوە •

جگە لەو ناتەواوییەی باسمکرد ناتەواوییەکی تریش هەیە لــە ڕاقەی وشەدا • ئەو ناتەواوییەش ئەوەیە ، کە ڕاقەی هەندێ وشە بە عەرەبی کراوە • وەك لە ڕاقەی ( باڵادڕانە )دا ئەڵێ : « حق القــدم ، حق السعی » • بە باوەڕی من پێویــســت بوو کەموکوڕی وەها لــە « فەرهەنگی خاڵ »دا نەبێ ، ئەویش نەك هەر لەبەر ئەوەی ، کە بە ئاسانی دەتوانرا ڕاقەی ئەم وشەیە بە کوردی بکرێ ، بەڵکــو لەبەر ئەوەش ، کە ئەم فەرهەنگە کوردی ــ کوردییە ، نەك کوردی ــ عەرەبی •

لە ڕەخنەکەمدا وتوومە : فەرهەنگی خاڵ کە مانایەك تەواو بوو

خاڵێك دائەنێ ، واتە کە خاڵ دانرا مانای پێشوو تەواو ، ئنجا تۆرەی مانای دووەمە ••• و چاكوابوو ژمارە دابنێ • بەڵام مامۆستا خـاڵ لەگەڵ باوەڕی منـدا نیـەو ئەڵێ : ئەو هەموو فەرهەنگە عەرەبیو فارسییانەی کە بەدەستمانەوەیە هەر بەو شێوەیەنو ئەمەی ڕەخنەگر ئەڵێ باوی نیە ، دووەم جێگا زۆر ئەگرێ •

دیسان هەر گەڕاینەوە سەر ئەوەی فەرهەنگی عەرەبیو فارسی وایانکردووە • جا گەر ئێمە توانامان هەبێت بۆچ پێشیان نەکەوین • بۆچی چاوەڕوانبین کە ئەوان ئەو هەنگاوە بنێنو ئنجا ئێمە بەدوایاندا •• هەروەها بەلامەوە سەیرە ، کە ئەڵێ ئەمە باوی نیە • ئەمە زانستە نەك مۆدە • کام ڕێگە باشتر بێت پێویستە ئەو ڕێگایە بگرین • ئەگەر ئەم شێوەیە کەمێکیش جێگە زیاتر بگـرێ ، بەڵام ئاساترەو خوێنـەر زووتر هەسـت بەو سنوورە ئەکات : کـە لەنێوان ماناکانی یـەك وشەدا هەیە •

جگە لـەوە زۆر جار ڕێدەکـەوێ ڕسـتەیەك تەواو ئەبێتو خاڵێك دائەنرێ ، بەڵام هێشتا مانای یەکەم تەواو نەبووە • ئەمەش ئەبێ بە هۆی سەرلێتێکدان •

هەروەها وشە هەیە چـەند مانایەکی جیاوازی هەیە ، کـە پێی ئەوترێ ( Polysementic ) • وشـەش هەن ، کە تەنها بە شێوە لەیەك ئەچنو هەر یەکە مانای تایبەتیی خۆی هەیەو بەم وشانە ئەڵێن ( Homonym ) • جا پێویستە ئەم دوو جۆرە وشەیە لە فەرهەنگدا جیابکرێنەوەو تێکەڵ نەکرێن • بەداخەوە لە « فەرهەنگی خـاڵ »دا تێکەڵ کراون ، ئەویش لەبەر ئەوەیە ، بەو شێوەیە نەیکردووە کە لـە وتارەکەمدا باسمکردووە[١٨] •

(١٨) هەمان سەرچاوە ، ژ ٢١ ، ل ٧ ؛ ژ ٢٢ ، ل ٦ •

ئەو ناتەواوییانەی لە « فەرهەنگی خاڵ »دا هەن زۆر کەمن و بە هیچ جۆرێك لە نرخی فەرهەنگەکە کەم ناکەنەوە • ئەم فەرهەنگە هێندە گرنگە کە چەند جارێك پێویست بە لە چاپدانەوە ئەکات • جا گەر لەچاپدانەوەدا ئەم چەند کەم و کوڕییەی لێ لاببرێ ، ئەوە تەنها نرخی بەرز ئەبێتەوە • ئەگەر ئێمەش لە چەند شوێنێکی کەمدا بیروڕامان لەگەڵ مامۆستا خاڵدا جیاواز بێت ، ئەوە مەبەستمان ئەوە نییە لە نرخی مامۆستاو کارە مەزنەکەی کەم بکەینەوە ، بەڵکو تەنها مەبەستمان ئەوەیە ، ئەو کارە گرنگە کەم و کوڕی تێدا نەمێنێ(*) •



(*) ئەم نووسینە لە ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، ژمارە ( ١٠٥ )و ( ١٠٦ )و ( ١٠٧ )و ( ١٠٨ )ی ساڵی ١٩٧٢دا بڵاوکراوەتەوە •

# چالاکیی مامۆستا گیو موکریانی

# لـــه مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا

مامۆستا گیو موکریانی دەورێکی گەورەو بەرزی بینیوە لـــە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا . ئەو زۆر چاك تێئەگات ، کە فەرهەنگ تا چ ڕادەیەك پێویستـــە ، چۆن لە ڕێـــگای فەرهەنگەوە ئەتوانرێ خزمەتی زمان بکرێ ، چـــۆن فەرهەنگ زمان ئەپارێزێو دەولەمەندی ئەکا ، چـــۆن فەرهەنگ ڕێگایە بۆ یەکخســـتنی زمانی کوردی ... هەستی مامۆستا گیو موکریانی بە پێویستیی فەرهەنگو هەستی کوردایەتی وای لێکردووە بە دەها ساڵ لە ژیانی لاویو پیری بۆ نووسینی فەرهەنگ تەرخان بکا هەر بۆ ئەوەی وشـــەی کوردی کۆبکاتەوەو بۆ ئەوەی وشەیەکی کوردی لەناو نەچێت شارو گوندی کوردستان نەماوە خۆی نەگەیەنێتێ . ئەوەتە مامۆستا لەم بارەیەوە لە پێشەکیی « فەرهەنگی مەهاباد »دا نووسیوێتی : « زاراوەی موکریانی بە هەموو هۆزو تیرەو دێهاتەکانەوە لەگەڵ هی شـــکاكو عەبدۆییو جەلالیو لوڕو کەلهوڕو سنە ( ئەردەلان ) بەپێی توانا ... کۆکردەوە . بۆ زاراوەی سورچیو خۆشناوو زراییو ئامێدی ساڵێکی لە باتاس دانیشتم لە ( ١٩٢٩ )دا . کە بەماڵەوە هاتمـــە هەولێر زاراوەی ئـــەو ناوچەیەو بادینانو کـــۆیەو پژدەریشم دەســـتکەوتن ... ٣ جاران چوومە سلێمانیو هەڵەبجەو هەورامانو زاراوەی سلێمانیو شارەزووورو

جافەو تاوکۆزی‌و هەورامانو ئی دیکەم ئەوەندەی لە تواناى سەلیقەم‌دا بوو‌بێ کۆم‌کردوونەتەوە ... »[1] .

مامۆستا گیو موکریانی نرخی فەرهەنگەکانی بەرزئەکاتەوە ، بەوەی ناوەرۆکەکانیان بریتی نین تەنها لە وشەی شارێك یاخود ناوچەیەکی تەسکی کوردستان ، بەلکو بریتین لە وشەکانی گەلێك لە شارو گوندو ناوچەکانی کوردستان . بەم جۆرە فەرهەنگەکانی سوودبەخشن نەك تەنها بۆ کۆمەلێکی کەم لە کورد ، بەلکو سوودبەخشن بۆ زوربەی کوردان . بەلام بەداخەوە ئێمە نرخی ئەو بیرە وردەو ئەو کارە پیرۆزەی مامۆستا نازانین . هەندێ جار کە وشەیەك لە فەرهەنگەکانی‌دا دەبینین‌و لێی تێ‌ناگەین ، وا دەزانین دانەر ئەو وشەیەی دوست‌کردووەو بە خۆڕایی یەخەی دەگرین ، کەچی بیر لەوە ناکەینەوە ، کە ئێمە لە سنووری شارەکەی خۆمان دەرنەچووین‌و وا دەزانین زمانی کوردی تەنها ئەوەیە لە شارەکەماندا بەکاردەهێنرێ . جا گوناهی خۆمان بەسەر مامۆستا گیو موکریانی‌دا دەدەین .

ڕاستە لە فەرهەنگەکانی مامۆستا گیو موکریانی‌دا کەم‌وکوڕی زۆرە ، بەلام ئەمە لە نرخی فەرهەنگەکانی‌و لە نرخی مامۆستا کەم‌ناکاتەوە . هۆی ئەو ناتەواویانەش زۆرن .

لەپاش فەرهەنگی ئەحمەدی ، کە سالی ( ١٧٩٥ ) دانراوە[2] تاوەکو دەرچوونی « فەرهەنگی ڕابەر » ( سالی ١٩٥٠ )[3] کە پتر لە

(١) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی مەهاباد » ، هەولێر ، ١٩٦١ ، پێشەکی ، ل ٥ـ٦ .

(٢) هەرچەندە « فەرهەنگی ئەحمەدی » لە سالی ١٩٣٦دا دوو جار لە بەغداو سلێمانی لە چاپدراوە ، بەلام مێژووی دانانی سالی ( ١٧٩٥ )ە .

(٣) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی ڕابەر » ، فەرهەنگێکی تو‌تابخانەی عەرەبی ـ کوردییە ، هەولێر ، ١٩٥٠ .

سەدەو نیوێك دەکات ، لە کوردستانی عێراق هیچ فەرهەنگێکی ئەوتۆ دەرنەچووە شایانی باس بێت[٤] . جا ئەمە هۆیەکی گەورەبە کە بووبێ بە هۆی بوونی هەندێ ناتەواوی‌و کەم‌وکوڕی . نەبوونی فەرهەنگ ، واتە نەبوونی کارێکی پێشوو ، نەبوونی سەرچاوەیەك کە مامۆستا سوودی لێ ببینێ‌و شوێن‌پێی بکەوێ‌و لەسەر ڕێگای بڕوات . جگە لەوە مامۆستا لە زانستگەیەکی بەرزی دەرەوە نەی‌خوێندووە تا بە تەواوی لەو جۆرە کارانەدا شارەزاییەکی تەواو وەربگرێت . ئەوەی هەبووە تەنها کۆششی خۆی بووە ، کە بە هەندێ زمانی بێگانە چەند فەرهەنگێکی خوێندۆتەوەو بینیونی ، یاخود بە بیروباوەڕی خۆی وای بە باش زانیوە بەو جۆرە بیکات . بێ‌گومان ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەی هاتوونەتە ڕێگای بە جۆرێك بوون ، کە ڕزگاربوون لێیان گران بووە ، بەتایبەتی لەو سەرەمەدا . جگە لەوە مامۆستا خۆی زۆر ڕاست ئەفەرموێ : « چۆن چاوەڕێی فەرهەنگێکی ڕاست‌و بێ‌هەڵە لە دانەرێك دەکرێ کە خۆی بەو پیرییەوە لە چاپخانەدا کارگەر بێت‌و بە دەستی خۆی چاپی بکات لە کاتێکدا کە بە ناچاری ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەیانییەوە تا ئێوارە بو پەیداکردنی نانی ( ١٠ ) سەر منداڵی وردو بێ‌دەسەڵاتی گیان بدات »[٥] . لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا گیو موکریانی بەسەر زوربەی ئەو تەنگ‌وچەڵەمانەدا سەرکەوتووەو کارەکانی لەسەر شێوەیەکی تازەو زانستین . لە زۆر شوێندا هونەرێکی بەرزی

---

(٤) ڕاستە لەو ماوەیەدا چەند فەرهەنگێك دانراون‌و لە چاپ‌دراون ، بەلام ئەو فەرهەنگانە ناتوانرێ بە بەرهەمی کوردستان لە قەڵەم بدرێن .. ئەوەش کە لای خۆمان کراوە ، ئەوە نییە کە شایانی باس بێت .

(٥) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی کۆلکەزێرینە » ، فەرهەنگی کوردی ـ فارسی ـ عارەبی ، فەرەنسایی ـ ئینگلیزی ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٢٠ .

بواندووه ‌. زۆر دەروازەی کردۆتەوە ، کە لەپێش ئەودا بەرامبەر بە فەرهەنگنووسیی کوردی داخرابوون ‌. ڕێگای بۆ ئەو فەرهەنگنووسانەی لەپاش ئەوەوە فەرهەنگی کوردییان نووسیوە ، تەختو ئاسانکرد ‌. گەلێك کاری ئالۆزی خاوکردۆتەوەو لێکۆڵینەوە لە فەرهەنگەکانی ئەم ڕاستییانە نیشانئەداو ئەیخاتە ڕوو ‌.

خاوەنی « چاپخانەی کوردستان »و « گۆڤاری هەتاو » — مامۆستا گیو موکریانی گەلێك بەرهەمی بەکەڵکی پێشکەش بە گەلی کوردمان کردووە ‌. لەبەر ئەوەی مەبەستی ئەم وتارە بەستراوە بە چالاکیی مامۆستاوە لە مەیدانی فەرهەنگنووسیدا ، بۆیە لێرەدا تەنها لەبارەی ئەو کارانەوە ئەدوێین ، کە پەیوەندییان بە نووسینی فەرهەنگەوە هەیە ‌.

هەرچەندە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا جووڵانەوەی نەتەوایەتیی میللەتی کورد لە کوردستانی عێراقدا پەرەی سەندو ڕۆژ بە ڕۆژ چاوی گەلی کوردمان پتر دەکرایەوەو گەلێك ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبی کوردی ، بەتایبەتی لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەرئەچوونو بایەخێکی زۆریان بە زمانی کوردی دەدا ، بەڵام لەو چەند وشانە زیاتر ، کە لە هەندێ گۆڤاردا وەك بەشی فەرهەنگۆك بڵاوئەکرانەوە هیچیتر لەبارەی کاری فەرهەنگنووسییەوە نەبوو ‌. لەم مەیدانەدا هەنگاوی یەکەم مامۆستا گیوی موکریانی نای ‌. ئەوە بوو ساڵی ١٩٥٠ « فەرهەنگی ڕابەر »ی لە چاپدا ‌.

« ڕابەر » فەرهەنگێکی قوتابخانەیی عەرەبی کوردییە ‌. لە ساڵی ١٩٥٠دا لە چاپخانەی کوردستان دەرچووە ‌. پەیدابوونی ئەم فەرهەنگە هەنگاوێکی گەورەیە لە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا ‌. نزیکەی ١٥ هەزار وشەی عەرەبییە ، کە ماناکانیان بە کوردی دراون ‌. تاکو

بلێی کارێکی گەورەو خاوێنەو نووسەر زۆر خۆی لەگەڵیدا خەریك کردووە • هەرچەندە بەسەر دەرچوونیدا نزیکەی ٢٠ ساڵ نێپەڕیوە ، بەڵام تاکو ئێستا بە یەکێك لە فەرهەنگە باشەکانی کوردی ئەژمێرێ •••

لە لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی مانای وشەدا ، لە وەرگێڕانی وشە عەرەبییەکان بۆ کوردیو ڕاڤەکردنی ئەو وشە عەرەبییانەی لە کوردیدا بەرامبەریان نییە ••• بەتێکڕایی سەرکەوتووە •

ئاشکرایە ، کە لە هەموو کارێکدا کەموکوڕیو ناتەواوی هەیە • جا هەندێك کار ڕەنگە کەم ناتەواویی هەبێو هەندێکیش زۆر • بێشك لە « فەرهەنگی ڕابەر »یشدا هەندێ ناتەواوی هەیە • ئەو ناتەواوییانە وەنەبێ هێندە زۆر بن ، کە لە نرخی فەرهەنگەکە کەمبکەنەوە •

بەکورتی لە ناتەواوییەکانی « فەرهەنگی ڕابەر » دەدوێین :

یەکێك لەو ناتەواوییانە ئەوەیە ، کە دانەر بۆ هەندێك وشەی عەرەبی ئەو مانا ڕاستە تەواوە نادات کە لە کوردیدا هەیەو کە ماناکەی بەتەواوی بەرامبەر ئەو وشە عەرەبییەیە • بۆ نموونە : بەرامبەر وشەی ( حملة ) چووە ( گەمارۆ )ی داوە ، بەڵام ( هێرش )ی نەداوە ، کە ماناکەی بە تەواوی ( حملة ) دەگەیەنێ • هەرچی ( گەمارۆ )یە مانای ( حصار )ە • ڕاستە نووسەر بۆ وشەی ( حصار ) ـ ( گەمارۆ )ی داناوە ، بەڵام ( حملة ) و ( گەمارۆ ) جیاوازییان هەیە •

بۆ دانی مانای هەر وشەیەکی عەرەبی هەموو ئەو وشە کوردییانەی داوە کە مانای تەواوی وشە عەرەبییەکە ئەدەن ، بەڵام لە هەندێ شوێندا ئەمەی بەتەواوی بۆ نەکراوە • وەك : بۆ دانی مانای ( ابد ) ئەم وشانە ( هەمیشە ، هەرچاخ ، بینا ، هەرگاف )ی داوە ، لەگەڵ ئەوەی لە کوردیدا ، جگە لەو وشانە « هەردەم ••• »یش هەیەو ئەم وشەیە کەمتر

ناسراو نیەو کەمتر لەو وشانەی دانەر بۆ مانای ( ابـد ) داونی ، بەکار ناهێنرێ .

هەروەها دەبینین بۆ دانی مانای ( اتتاج )ی عەرەبی ( بەرهەم )ی کوردی نەداوە ، لەگەڵ ئەوەی مانای تەواوی ( اتتاج ) ـ ( بەرهەم )ە .

لە مەسەلەی چۆنیەتی هەڵبژاردنی وشەشدا بۆ فەرهەنگەکـە ، هەندێ کـەموکوڕی هەیە . وەك لەوەی ، کـە زۆر وشە هەن کەم بەکاردەهێنرێن و کەوتوونەتە ناو فەرهەنگەکەوە ، کەچی زۆر وشـە هەن و زۆر بەکاردەهێنرێن و پێویستن و نەکەوتوونەتە ناو فەرهەنگەکەوە. ئەمەش وەنەبێ هەر ناتەواویەکی مامۆستا گیو موکریانی بێت ، بەڵکو ناتەواویەکی زوربەی فەرهەنگنووسەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکانیش بووە لە ساڵانی ( ٥٠ )ی سەدەی بیـستەمدا . چ وشـەیەك پێویستە بکەوێتە ناو چ فەرهەنگێکەوە ؟ چ وشەیەك پێویستە نەکەوێتە فلان فەرهەنگەوە ؟ تاکـو ئێستا بە شێوازێکی زانستی لـە هیچ وڵاتێکی جیهـاندا نەبڕاوەتەوەو هێشـتا کۆسپێکی گەورەیە لـە ڕێگای فەرهەنگنووساندا . گەورەترین فەرهەنگنووسی سۆڤێت ئەکادیمی ل . ڤ . شێربە ئەڵێ : « کێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ یەکێکە لە کێشە هەرە زەحمەتەکانی فەرهەنگنووسی »[٦] .

لەپاش دەرچوونی « فەرهەنگی ڕابەر » پێنج ساڵ تێپەڕی بێ ئەوەی لە کوردستان یاخود لە دەرەوەی کوردستان هیچ فەرهەنگێکی کوردی دەربچێت . هەنگاوی دووەم لە دانانی فەرهەنگی کوردیدا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا هەر مامۆستا گیو موکریانی نای .

---

(٦) ل . ڤ . شێربە ، تیۆریی فەرهەنگنووسیی ، مۆسکۆ . ١٩٤٠ ، ل ١٠٦ ( بە زمانی ڕووسی ) .

ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٥دا فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی لەژێر ناوی « کۆلکەزێڕینە »دا لە چاپدا . « کۆلکەزێڕینە » بە ڕەنگ بچووکە ، بەڵام کارێکی ئێجگار بەنرخە . ئەمە یەکەم فەرهەنگە ، کە لەسەر ئەم شێوەیە نووسرابێ . لەپێش دەرچوونی ئەم فەرهەنگەدا نە لە کوردستانو نە لە دەرەوەی کوردستان فەرهەنگی کوردی لەم جۆرە نەبووە . هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبێ گرنگی بە « کۆلکەزێڕینە » بدرێ . بێ‌گومان ئەم فەرهەنگە ئێجگار پێویستو بەکەڵکە . وشەکانی ئەم فەرهەنگە بەسەر ( ٥٩ ) پۆلی بچووکدا دابەش‌کراون . پێوەندی لە نێوان وشەکانی هەر پۆلێکدا هەیەو لەژێر سەرباسی خۆیاندا ڕیزکراون ، وەك : ئاین ، زاراوەی زانیاری ، ژمارەکان ، دانیشگەو کەرەستەکانی ، ڕەنگەکان ، کشتوکاڵ ، باڵدارەکان ، ماڵاتی کەوی ، دەعبایانی کێوی ، زیندەوەرانی ئاوی ، لە شاردا ، ڕاناوەکان ، دواکات ... هتد . بەشی زۆری ئەم سەرباسانە ڕاستنو پێویستن ، بەڵام ئەوەی ناتەواوی بێ تیایاندا ، ئەوەیە کە ڕێزمانی تێکەڵاو کردوون . ڕێزمان بەشێکی تایبەتی‌یە لە زانستی زمان . جا ڕێگای تر هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی ، نەوەك لە شێوەی فەرهەنگدا . گومانی تێدا نییە ، کە ڕێزمان سوودی هەیە لەناو فەرهەنگدا ، بەڵام نەك بەو جۆرەی لە « فەرهەنگی کۆلکەزێڕینە »دا ئەبینرێت ، کە کراوە بە چەند پۆلێكو هەر پۆلێکیش لەژێر سەرباسێکدا دانراوە . سەرەڕای ئەوەش خراونەتە ناوەڕاستی فەرهەنگەکەوە . ڕاسترین ڕێگا ئەوەیە لە سەرەتا یاخود لە کۆتایی فەرهەنگەکەوە بێت ، وەك چۆن لە فەرهەنگی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ، مامۆستا عەلائەدین سەجادی ، قەناتی کوردۆ ... دا هەیە . ئەویش بە مەرجێك دانەر بە درێژی هەموو ڕێزمانی کوردی باس نەکات ، بەڵکو بە کورتی‌و

شتی پێویست و بەکەڵك تۆماربکات . هەروەها ئەبێ بەشی ڕێزمان بە جۆرێ بێت ، کە پەیوەندی بە بەکارهێنانی فەرهەنگەکەوە هەبێت ، بۆ ئەوەی بەکارهێنانی فەرهەنگەکە ئاسان بکات ، ئەوەك بە خـۆڕایی بارێك بێت بەسەر فەرهەنگەکەوە .

مامۆستا قەناتی کوردۆ لەبارەی « فەرهەنگی کۆلکەزێڕینە »ەوە ئەڵێت : ئەبێ ددان بەوەدا بنێین کـــە دانەر کارێکی زۆر گــەورەو گرانی لە ڕێگادا بووە بۆ دانانی سەرباسەکانو بۆ دابەش کردنی وشە بە سەریاندا . بێ گومان بۆ هەندێك سەرباسی وەك : زاراوەی زانیاری ، لە شاردا ... هتد هەڵبژاردنی وشە زۆر گران بووە ، بەڵام بۆ باسەکانی : ژمارەکان ، ڕەنگەکان ، لەش و ئەندامەکانی ... هتد دانی وشـــە ئاسان بووە[٧] .

لەگەڵ باوەڕی مامۆستا قەناتی کوردۆدام کـــە نووسیویەتی : بەگشتی ( کۆلکەزێڕینە ) فەرهەنگێکی سەرکەوتووباشە[٨] . دیارە دانەر خۆی زۆر لەگەڵیدا خەریك کردووە . لە زۆر شوێندا هونەرێکی ڕاست و بەرزی نواندووەو بەسەر زۆر گیروگرفتـــدا سەرکەوتووە ، لەگەڵ ئەوەی فەرهەنگێك لەو چەشنە لەپێش ئەودا نەبووە تا مامۆستا گیو موکریانی چاوی لێ بکاو کەڵکی لێ وەرگرێ . لە نەخشەکێشانو هەڵبژاردنو دابەش کردنی وشـــە بەسەر هەندێك پۆلـــدا بە تەواوی ســـەرکەوتووە ، وەك : وتەی ناو قوتابخــــانەکان ، ڕەنگەکان ، باڵدارەکان ... هەروەها باشتر بوو گەر ســـەرباسی ( باڵدارەکان ) بەسەر ( ماڵی )و ( کێوی )دا دابەش بکات . هەرچەندە دانەر ئەمەی

---

(٧) قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، پێشەکی ، ل ١٠ .

(٨) هەمان سەرچاوە ، ل ١١ .

نەکردووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕیزکردنی وشــــە کوردییەکاندا نەکەوتۆتە هەڵەوەو لەسەر ڕێگایەکی ڕاستو نوێ ڕۆیشتووە ، وەك دەبینین لە پێشدا ناوی هەموو باڵدارانی ماڵی داوەو ئنجا هاتۆتە سەر باڵدارانی کێــــوی • دوابەدوای باڵدارانی کێوییش ئەو وشـــــانەی نووسیوە ، کە بەگشتی پەیوەندییـــــان بە باڵدارانەوە هەیە ، وەك : دەنوك ، باڵ ، هێلکە ، هێلانە •••

لە فەرهەنگێك کە بۆ یەکەم جار لەسەر ئەم شێوەیە دانرابێ ، چاوەڕوان ناکرێت کە وا لە هەڵبژاردنی وشەو دابەشکردنیدا ، لــــە نەخشەکیشانو ناوەرۆکیدا بێ کەموکوڕی بێت • هەر لەبەر ئەوەشە لە هەندێك پۆلە وشەدا ناتەواوی هەیەو زۆر وشەی پێویست پەڕێنراوە• وەك : لە پۆلە وشەی ( ئەندامەکانی لەش )دا دانەر جوان دەستی بەدەشە کردووە بە دانانی وشەکانی : سەر ، سنگ ، سك ••• ئەگەرچی لەم بەشەدا پاشو پێشخستن هەیە ، بەڵام زۆر نییە • کەموکوڕی گەورە لەوەدایە ، نووسەر وشەکانی ( قاچ ، پێ ، ڕان ، ئەژنۆ ••• )ی لەگەڵ ئەم پۆلە نەداوە لەگەڵ ئەوەی کە ( دەست ، قۆڵ ، ئانیشك ، مەچەك ، لەپ ••• )ی داوە • جا لەبەر ئەوە ئەم بەشە ناتوانرێت بە سەرکەوتوو دابنرێت •

هەروەها لە ( ڕۆژانی هەفتە )دا ، کە تاکو بلێیت کۆکردنەوەی وشە بۆ ئەم بەشە ئاسانە ، کەچی ئەبینین کەموکوڕی تیـــایە ، ئەویش ئەوەیە ناوی شەش ڕۆژی هەفتە دراوە ، بەڵام (دووشەممە) پەڕێنراوە • بێشك ئەمە نەك هەر کەموکوڕییە ، بەڵکو هەڵەیەکی گەورەیە ، کە نەئەبوو بکرێ •

جگە لەوەی لــــە جیاکردنەوەی هەندێك پۆلــــە وشـــــەدا هەڵە ئەبینرێت ، هەروەها ئەوەش دەبینرێ کە زۆر جار چەند وشەیەك ئەخاتە

ناو پۆلێك وشەوە کە هیچ پەیوەندیان بەو پۆلە وشەیەوە نییە . وەك : لەگەڵ پۆلە وشەی ( زیندەوار ـ الحشرات )دا وشەی ( کیسەڵ )ی داناوە ؛ لەگەڵ ئەوەی ( کیسەڵ ) لەو سەرباسەوە زۆر دوورە . هەروەها ئەبینین ئەم وشانە : ( وێژە ، وێژەوان ، سەرکردە ، قوتابی ، قوتابخانە ، پرتوك ، نەخشە )ی لەژێر سەرباسی ( کاتان )دا ڕیزکراون لەگەڵ ئەوەی هیچ پەیوەندیەکیان بە ( کات )ەوە نییە . بەداخەوە لەم جۆرە هەڵانە زۆرن .

هەندێك سەرباس هەن ئێجگار فراوانن ، وەك سەرباسی ( لە شاردا ) . ئەگەر بە وردی لەو وشانەی پەیوەندیان بەم سەرباسەوە هەیە ، بکۆڵینەوە ، ئەوە ئەبینین زوربەی ئەو وشانەی بەسەر زاری مرۆڤەوەن پەیوەندیان بە سەرباسی ( لەشاردا )وە هەیە . جا بەم جۆرە ژمارەی وشەکانی ژێر ئەم سەرباسە لە چەند هەزار وشەیەك تێپەڕئەبن . لەبەر ئەوە پۆلە وشە لەژێر ناوی سەرباسێکی وەها فراواندا بە باوەڕی ئێمە ڕاست نییە . دەشێ سەرباس لەژێر ئەم ناوەدا بمێنێتەوە ، بە مەرجێك بکرێت بە چەند لقێك ...

لەم جۆرە فەرهەنگانەدا لێکدانەوەی مانای وشە مەبەستی سەرەکی نییە ، لەبەر ئەوە لەم بارەیەوە بە درێژی لێی نادوێین ، تەنها ئەوە ئەڵێین ، کە لە هەندێ شوێندا هەڵە لە ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی وشە کوردییەکاندا هەیە .

ئەم لێکۆڵینەوە سەرپێییە نیشانیدەدا کە وا لە « فەرهەنگی کۆلکەزێرینە »دا ناتەواوی هەیە . بەشێکی زۆری ئەو ناتەواویانە ئەتوانرێت بخرێتە ئەستۆی دواکەوتنی کاری فەرهەنگنووسیی کوردی لەو سەردەمەدا . ئەو کەموکوڕییانەی باسمانکردن لەو کارە پیرۆزە کەمناکەنەوەو ئەوە دەڵێین ، کە مامۆستا گیو موکریانی بە دانانی

« فەرهەنگی کۆلکەزێڕینە » جێـــگایەکی بێهاوتای لـــە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا وەرگرت .

لەپاش ئەم هەنگاوە گەورەیەی مامۆستا گیو موکریانی ، کاری فەرهەنگنووسیی کـوردی بۆ پێشـــەوە کـەوتە ڕێ . دوابەدوای « کولکەزێڕینە » گەلێك فەرهەنگی کوردی لەچاپ دران . وەك : فەرهەنگی مەردۆخ[9] ، فەرهەنگی ئەرمەنی ـ کوردی[10] ، فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی[11] ، فەرهـەنگی کوردی ـ ڕووسی[12] [13] ، فەرهەنگی خاڵ[14] ... هتد .

بەم جۆرە ئەبینین ، کە بە دەرچـوونی « فەرهـەنگی ڕابەر »و « فەرهەنگی کۆلکەزێڕینە » لاپەڕەیەکی نوێ لە کاری فەرهەنگنووسیی کوردی دەستپێئەکات ، کە بە بەرهەمترین و پێشـکەوتووترین کات دەژمێررێت لە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا .

جگە لەوەی کە مامۆستا گیـــو موکریانی ڕێگای نیشـــانی فەرهەنگنووسانی کورد دا ، خۆشی نەوەستاو چالاکانە بەرەو پێشەوە

---

(9) شێخ محەمەدی مەردۆخ ، « فەرهەنگی مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦

(10) سەمەندی سیابەند ، ئارامێ چاچان ، خەبەرناما ئەرمەنی ـ کوردی ، یەریڤان ، ١٩٥٧ .

(11) ئی . ئۆ . فاریزۆف ، فەرهــەنگی ڕووسی ـ کـوردی ، مۆسـکۆ ، ١٩٥٧ .

(12) چ . خ . باکایێف ، فەرهـــەنگی کـوردی ـ ڕووسی ، مۆسـکۆ ، ١٩٥٧ .

(13) ق . کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(14) شێخ محەمەدی خـاڵ ، « فەرهەنگی خـاڵ » ، ب ١ـ٢ ، سـلێمانی ، ١٩٦٠ ـ ١٩٦٤ .

ڕۆیشت • بەرهەمی ئەم تێکۆشانەش ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦١دا فەرهەنگێکی کوردی ـ عارەبی لە ژێر ناوی « فەرهەنگی مەهاباد »دا لە چاپداو ئەمیش هەنگاوێکی کە یە بەرەو پێشەوە لە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا •

ئەم فەرهەنگە چ لە ڕووی زۆری وشەوە ، چ لەبارەی شێوازو جۆری دانانیەوە جیاوازی زۆرە لەگەڵ فەرهەنگەکانی پێشوویدا ، بەتایبەتی لەوەی « فەرهەنگی مەهاباد » زۆر باشترەو کەموکوڕی کەمترە لە فەرهەنگەکانی کەی • ئەویش لەبەر ئەوەیە ، کە دانەر لەو ماوەیەدا پتر چاوی کراوەتەوەو پتر فێربووەو هەروەها پێشکەوتنی فەرهەنگنووسیی کوردی کاری کردۆتە سەر • بەم جۆرە مامۆستا گیو موکریانی لە « فەرهەنگی مەهاباد »دا گەلێک کاری ئاڵۆزی خاوکردۆتەوەو چەوتیی پێشووی ڕاست کردووەتەوە •

ژمارەی وشە کوردییەکانی ئەم فەرهەنگە نزیکەی ( ٣٠ ) هەزار وشەیەکە ـ واتە دوو ئەوەندەی « فەرهەنگی ڕابەر »ە • لە چۆنیەتی ڕیزکردنو ڕێکخستنی وشەکاندا لەسەر ڕێگایەکی ڕاستو جوان ڕۆیشتووە • گەلێك وشەی تازەپەیدابووی تێدایەو ئەم جۆرە ڕێگایە تەنها نرخی فەرهەنگ بەرزدەکاتەوە • ئەم فەرهەنگە بە تەواوی لەگەڵ ئەو مەبەستەی بۆی دانراوە ئەگونجێ •

لەگەڵ ئەو هەموو هەنگاوە نوێیانەدا کە دانەر ناونی ، کەچی بەداخەوە ئەم فەرهەنگەش هێشتا لە چەند کەموکوڕییەك دوور نییە • وا بە کورتی هەندێك لەو کەموکوڕیانە ئەخەینە پێش‌چاو :

یەکێك لەو کەموکوڕیانە ئەوەیە ، کە دانەر لە چەند شوێنێکی کەمدا لە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی وشە کوردییەکاندا ـ واتە ( بۆ ئەو کۆمەڵە وشانەی لە دروستبووندا پێوەندییان لە نێواندا هەیە ) ـ گرنگی نەداوەو ئەمەش بووە بە هۆی ئەوەی هەندێك وشەی

پێویست نەکەوتە نلو فەرهەنگەکەوە ٠ بۆ نموونە : وشەی (دەرەبەگ) هەیە ، بەلام ( دەرەبەگایەتی ) نییە ، ( دەستدرێژ ) هەیەو ( دەست درێژکردن ) نییە ، ( دز ، دزین ، دزراو ) هەیەو کەچی ( دزی ، دزیکردن ) نییە ... هتد ٠

کەمو کوڕییەکی گەورە لە نەکردنەوەو ئاشکرانەکردنی مانای وشەدا بە تەواوی و لە نیشان نەدانی چۆنیەتی بەکارهێنانی وشەدا دەبینرێ ٠ ڕاستە زۆر وشەی کوردی هەیە ئەتوانرێ مانای بە عەرەبی بە یەك وشە بدرێ ، بەلام لە هەندێ شوێندا دوور نییە ئەو وشە عەرەبییە لە زمانی عەرەبیدا چەند مانایەکی هەبێ ٠ جا لەو جۆرە شوێنانەدا مرۆڤ گەر هەردوو زمانەکە بە باشی نەزانێ ، ئەوسا تێناگا کە بۆ کام مانا ئەو وشە عەرەبییە دانراوە ٠ بۆ نموونە : بەرامبەر بە ( سەیر )ی کوردی ( غريب ) نووسراوە ٠ ئاشکرایە ، کە ( غريب ) لە عەرەبیدا تەنها مانای ( سەیر ) ناگەیەنێ ٠ جا بەم جۆرە ، وەك وتمان ئەگەر مرۆڤێك شارەزای هەردوو زمانەکە نەبێت ، ئەوسا ناتوانێ تێبگات ٠ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کۆسپە ، باشترین ڕێگا ئەوەیە بنووسرێ ( غريب ) بۆ کام مانای ... هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەو نیشاندانی ماناو فێرکردنی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم وشەیە ، باشتر وایە بخرێتە ڕستەیەکی کورتی ئاسانەوە ٠ ئەمەش ئەو ڕێگایەیە ، کە فەرهەنگنووسانی ولاتە پێشکەوتووەکان لە سەری ئەڕۆن ٠ بەداخەوە تاکو ئەمڕۆ زوربەی فەرهەنگنووسە کوردەکان هەستیان بەمە نەکردووە ، جگە لە مامۆستا قەناتی کوردۆو مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵو مامۆستا تۆفیق وەهبی و مامۆستا عەلائەدین سەجادی و هەندێکیتر ، کە لەم بارەیەوە هەنگاوێکی گەورەیان ناوەو کاری فەرهەنگنووسیی کوردییان پێشخستووە ٠

زانینی مامۆستا گیو موکریانی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشەوە ئەڕوات . هەر نووسراوێکی نوێی گەلێك خاوێنتر ، جوانتر ، پڕ لە هونەری بەرزترە ، وەك لە کارێکی کۆنی . بۆ نموونە ئەبینین « فەرهەنگی مەهاباد » زۆر پوختترە وەك لە « فەرهەنگی ڕابەر »و چاپی دووەمی « کولکەزێڕینە » کەمتر ناتەواوی تێدایە وەك لە چاپی یەکەمی .

لە ساڵی ۱۹٦٦دا چاپی دووەمی « کۆلکەزێڕینە » دەرچوو . چاپی دووەم بریتییە لە هەڵبژێری و پترکردن . چاپی دووەم گەلێك جیاوازی لەگەڵ چاپی یەکەم هەیە . زۆر لەو ناتەواوییانەی لە چاپی یەکەمدا هەبوون دوورخراونەتەوە . ئەو وشانەی پێویست نەبوون بکەونە ناو بەشی ( کاتان )ەوە دوورخراونەتەوەو لادراون . جگە لە لادان گەلێك وشەی تازەی پێویست کە پەیوەندییان هەیە بە کاتەوەو لە چاپی یەکەمدا نەبوون لە چاپی دووەمدا نووسراون . لە چاپی دووەمدا هەر حەوت ناوی ڕۆژانی هەفتە دراوە . ئەو پەڕاندنەی لە چاپی یەکەمدا هەبووە چارەسەرکراوە . بەم جۆرە گەلێك کەموکوڕی چاككراوە . هەروەها گەلێك سەرباسی بەکەڵكو نوێی وا زیادکراون ، کە لە چاپی یەکەمدا نەبوون . بە تێکڕایی ناوەڕۆکی هەموو سەرباسەکان فراوانکراون . ئەو کەموکوڕییانەی لە بەشی ڕێزماندا هەبوون و باسمانکردن ، دوورخراونەتەوە . بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم چاككردنانەشدا هێشتا چاپی دووەم دوور نییە لە چەند کەموکوڕییەك :

لەژێر هەندێ سەرباسدا وشە هەن کە پەیوەندییان نییە بەو سەرباسەوە ، کەچی کەوتوونەتە ناوییەوە ، لەگەڵ ئەوەی وشەی پێویست هەنو پێوەندییان هەیە پێوەیو نەکەوتوونەتە ناوی . لە بەشی کوردییەکەیدا هەندێ وشە تۆمارکراوە ، بەڵام بەرامبەری چییە بە چوار زمانەکەی تر نەنووسراوە . ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو وشانە لەو زمانانەدا بەرامبەریان نییە یاخود دانەر نەیزانیوە . وەك : لە لاپەڕە ( ۱۱۰ )دا

— « لێ گرتەوە » ، لە لاپەڕە (١٤٠)دا — « خرووگە » ، لە لاپەڕە (١٦٦)دا — « گوران » ... هتد .

ئەگەر وشەیەکی کوردی بەرامبەری نەبێت لە زمانێکی بێگانەدا خۆ ئەتوانرێ بە ڕاڤەیەکی کورت یاخود بە ڕستەیەکی ئاسانی کورت مانای ئەو وشەیە لێك بدرێتەوە .

جگە لەو فەرهەنگانەی باسمان کردن ، مامۆستا گیو موکریانی « فەرهەنگی کوردستان »یشی داناوە ، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا لەبەر هەژاری و دەستکورتی نەیتوانیوە لە چاپی بدا . هەروەها تاکو ئەمڕۆ نە کەسێك نە کۆمەڵێك نەبووە یارمەتی مامۆستا بدەن و ئەو ئەرکە بخەنە سەر شانیان . « لەناو گۆڤاری هەتاوی هەتیوو جوانەمەرگیشدا زۆر جارانم هاوارکرد کە دەستە جوامێرێکی دڵسۆز وەیا چەند دەوڵەمەندێکی بێنە پێش فەرهەنگی کوردستانیان بە خۆڕایی بە هەموو مافێکەوە پێشکەش دەکەم ، داخەکەم کەس سەری هەڵنەدا »[١٥] .

« فەرهەنگی کوردستان » لە کوردییەوە بۆ کوردییەو بریتییە لە (٤٠) هەزار وشە .

لەبەر ئەوەی دەستنووسی ئەم فەرهەنگەمان نەبینوە ناتوانین لێی بدوێین . ئەوەندە هەیە ، هیوامانە کوردانی دڵسۆز یان هەندێك ڕێکخراو یارمەتی مامۆستا گیو موکریانی بدەن بۆ چاپکردنی « فەرهەنگی کوردستان » . چاپکردنی « فەرهەنگی کوردستان » تەنها یارمەتی نییە بۆ مامۆستا گیو موکریانی ، بەڵکو کارێکی زۆر گەورەیە بۆ خزمەتی زمانی کوردی . ڕەنگە هەندێك لەبەر ئەوەی کارەکانی مامۆستا کەموکوڕییان تێدایە ، بیخەنە پشتگوێ . هەرچەندە کەموکوڕی زۆربن لە « فەرهەنگی کوردستان »دا ، بەڵام دەرچوونی

---

(١٥) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی مەهاباد » ، هەولێر ، ١٩٦١ ، ل ١٤

ئەم فەرهەنگە لە سوود بەولاوە زیان نادات‌و گوناهە ئـەو بەرهەمە گەورەیە بە خۆڕایی لە دەست بچێت • ئەگەر « فەرهەنگی کوردستان » نەتوانێ ببێ بە فەرهەنگێکی سەرکەوتوو ، خۆ ئەبێ بە سەرچاوەیەکی گەورەو پێویست بۆ فەرهەنگ‌نووسیی کوردی •

چالاکی مامۆستا گیو موکریانی لە نووسینی فەرهەنگی کوردیداو لە چۆنیەتی دانانی فەرهەنگەکانیدا لەگەڵ ناوەڕۆکەکانیـدا پلەیەکی بەرزی نوێ نیشان‌ئەدات لە کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردی‌دا لـــە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا •

لێکۆڵینەوە لە بیروباوەڕی مامۆستا لە فەرهەنگ‌نووسینداو لـە چۆنیەتی پێکهاتنی فەرهەنگەکانی کەڵکێکی تایبەتی گەورەی هەیە بۆ ئەمڕۆی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی‌و بۆ گەلێك ڕێگای چۆنیەتی دانانی فەرهەنگ • لە فەرهەنگەکانی مامۆستادا ئەتوانرێ زۆر شتی بەکەڵك‌و بەنرخ بدۆزرێتەوە ، کە سوودیان هەبێت نەك تەنها بۆ فەرهەنگ‌نووسیی کوردی ، هەروەها بۆ گەلێك کاری زانستی زمان •

کۆششی مامۆستا گیو موکریانی لاپەڕەیەکی گرنگە لە مێژووی پێشـــکەوتنی زمانی کوردیدا • لێکۆڵینەوە لـە زمانەوانیی مامۆستا بەگشتی‌و کاری فەرهەنگ‌نووسیی بەتایبـــەتی ســـەرنجی هەموو زمانەوانانی کوردو کوردناسان ڕائەکێشێ •

لەم وتارەدا مەبەستمان ئەوە نییە ، کـە بە باڵای مامۆستا گیـو موکریانی‌دا هەڵدەین ، یا بە هۆی ئەو کەم‌و کوڕییانەوە بمانەوێ لـە نرخی کەم بکەینەوە ، بەڵکو مەبەســـتمان ئەوەیە لە ڕێگای ڕاستی زانستی‌یەوە ، ئەوەی هەیە بیخەینە بەرچاو(*) •

---

(*) ئەم بەرهەمە لە ژمارە (١٠٠) و (١٠١) و (١٠٢) و (١٠٣)ی ساڵی ١٩٧٢ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا بڵاوکراوەتەوە •

# فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەرخوێن

سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەورێکی نوێو بە بەرهەمە لە مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیدا • دەبینین لە ماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییدا چ لە وڵاتو چ لە دەرەوی وڵات گەلێک فەرهەنگ دەرچووە ، وەك : « فەرهەنگی ڕابەر »[1] ، « فەرهەنگی کۆلکەزێرینە »[2] ، « فەرهەنگی مەردۆخ »[3] ، « فەرهەنگی ئەرمەنی ــ کوردی »[4] ، فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی »[5] ، « فەرهەنگی ڕووسی ــ کوردی »[6] ، « فەرهەنگی خاڵ »[7] ،

---

(١) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی ڕابەر » ، فەرهەنگێکی قوتابخانەی عەرەبیو کوردییە ، هەولێر ، ١٩٥٠ .

(٢) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی کۆلکەزێرینە » ، کوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ــ فەرەنسی ــ ئینگلیزی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، چاپی دووەم ، هەولێر ، ١٩٦٦ .

(٣) شێخ محەممەدی مەردۆخ ، « فەرهەنگی مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦

(٤) سەمەندی سیابەند ، ئارامی چاچان ، « خەبەرناما ئەرمەنی ــ کوردی » ، یەریڤان ، ١٩٥٧ .

(٥) ا ــ چ . بەکۆ ( باکایێف ) ، فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

ب ــ ق . کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

(٦) ئی . ئۆ . فاریزۆف ، فەرهەنگی ڕووسی ــ کوردی مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

(٧) شێخ محەممەدی خاڵ ، « فەرهەنگی خاڵ » ، ب ١ ــ ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ــ ١٩٦٤ .

« فەرهەنگا کوردی »[8] ، « فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی »[9] ، « فەرهەنگی کوردی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی »[10] و گەلێکی‌تر .

لە نێوان ئەو فەرهەنگانەدا « فەرهەنگا کوردی » هەیە ، کە مامۆستا جگەرخوێن دایناوە . لە ساڵی ١٩٦٢دا بەرگی یەکەم و دووەمی لە بەغدا چاپ کراوە . ئەوەندەی من لێی بزانم هێشتا بەرگی سێیەمی دەرنەچووە . بێ‌شك ئەم فەرهەنگە گەنجینەیەکە لە سامانی زمانی کوردیمان و دەوری خۆی بینیوە و ئەیبینێ ... بەڵام بەداخەوە لەم فەرهەنگەدا کەم‌وکوڕی و ناتەواوی ئێجگار زۆرە ، کە دەتوانرا بە ئاسانی دووربخرێنەوە .

ئەگەر ئەم فەرهەنگە لەگەڵ « فەرهەنگی ڕابەر »ی مامۆستا گیو موکریانی ، کە لە ساڵی ١٩٥٠دا دەرچووە بەراورد بکەین ، یان لەگەڵ « فەرهەنگی خاڵ »ی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ، کە بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٩٦٠دا بڵاوکراوەتە بەرانبەر ڕابگرین ، دەبینین ، کە کەم‌وکوڕیی لە « فەرهەنگا کوردی »دا گەلێك زۆرترە وەك لەو دوو فەرهەنگەی لە سەرەوە ناومان بردن ، لەگەڵ ئەوەی فەرهەنگی مامۆستا جگەرخوێن لەپاش « فەرهەنگی ڕابەر »و « فەرهەنگی خاڵ » دەرچووە . لێرەدا وا دەرئەوێ ، کە مامۆستا جگەرخوێن سوودی لەو فەرهەنگە کوردییانە نەبینیوە کە لە پێش فەرهەنگەکەی ئەودا دەرچوون و کە زۆر کاری ئاڵۆزیان خاوکردۆتەوە و بەسەر گەلێك کۆسپدا

---

(8) جگرخوین ، « فەرهەنگا کوردی » ، ب ١ـ٢ ، بەغدا ، ١٩٦٢ .

(9) تۆفیق وەهبی و س . ئەدمۆنس ، فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی ، لەندەن ، ١٩٦٦ .

(10) جۆیس بلۆ ، فەرهەنگی کوردی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی ، پاریس ، ١٩٦٥ .

سەرکەوتوون . هەروەها نووسەر بۆ چۆنیەتی نووسینی فەرهەنگەکەی سوودی لە هیچ سەرچاوەیەکی وڵاتە پێشکەوتووەکان وەرنەگرتووە . ئەو سوود نەبینینە بووە بە هۆی ئەوەی « فەرهەنگا کوردی » نەوەك هەر کەموکوڕی پتر بێت لە « فەرهەنگی ڕابەر »و « فەرهەنگی خاڵ » ، بەڵکو هەندێك ناتەواوی تێدایە ، کە ئەو جۆرە ناتەواویانە هەتا لە فەرهەنگی ــ یووسف ضیا پاشای خالدی ــ یشدا نییە ، کە لە ساڵی ١٣١٠ك/١٨٩٣زدا لە چاپدراوە[١١] .

ئاشکرایە بەر لەوەی فەرهەنگنووس دەست بە نووسینی فەرهەنگ بکات ، پێویستە بزانێ بۆ چ مەبەستێك ئەو فەرهەنگە دائەنێ و لە سەرەتای دەستپێکردندا نەخشەی چۆنیەتی فەرهەنگەکە بکێشێ . دانەر ئەبێ پەیڕەوی ئەو مەبەستو نەخشەیە بکات ــ واتە لە مەبەست لانەداو لە سنوور نەچێتە دەرەوە . هەروەها پێویستە لە پێشەکیی فەرهەنگەکەدا بنووسرێ بۆ چ مەبەستێكو بۆ کێ ... ئەو فەرهەنگە دانراوە . هەرچەندە مامۆستا جگەرخوێن مەبەستی دانانی فەرهەنگەکەی لە بەرگی یەکەمدا نەنووسیوە ، بەڵام هەر باشە کە لە بەرگی دووەمدا نووسیوێتی : ئەم فەرهەنگە بۆ خوێندنی شێوەی کرمانجیی لە بەشی کوردییەکە ... لێرەدا زۆر باشە ، کە مامۆستا مەبەستی نووسینی فەرهەنگەکەی دیاریکردووە . بەڵام بەداخەوە زوربەی ئەو وشانەی کەوتوونەتە ناو ئەم فەرهەنگەوە لە سنووری مەبەستی نووسینی فەرهەنگەکە چوونەتە دەرەوە . بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەم باوەڕە ، ئەوەیە دەبینین گەلێك وشە هەن ، کە نەئەبوو لەناو فەرهەنگەکەدا بنووسرێن ، کەچی نووسراون . وەك : ناوی گوندو شارەکانی

---

(١١) یوسف ضیاء الدین باشا الخالدی المقدسی ، الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة ، استانبول ، ١٣١٠هـ / ١٨٩٣م .

کوردستان ، ناوداران ، خێڵەکانی کــورد ، شاعیرانو نووســەران ، هونەرمەندانو گۆرانی‌بێژانی جیهان ... لێرەدا ناڵێم کە ئەم جۆرە وشانە پێویست نینو نابێ لە فەرهەنگدا بنووسرێن ، بەڵام ئەڵێم لەگەڵ مەبەستو ڕێبازی فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەرخوێن‌دا ناگونجێن . ڕاستە گەر مەبەستی فەرهەنگەکەی فراوانتر بوایە ئەوسا ئەو وشانە پێویست بوون . وا دیارە نووسەر گرنگی نەداوە ، کە بە گوێرەی ئەو مەبەستەی هەیبووە وشە کۆبکاتەوەو هەڵبژێرێ ، بەڵکو چی زانیوەو چی دەستکەوتووە نووسیوێتی‌و ئەمەش تووشی هەڵــەی کردووەو بووە بە هۆی ئەوەی زۆر لابدات لە سنووری ئەو مەبەستەی هەیبووە . ئەم گرنگی‌نەدانو لادانەش بووە بە هۆی ئەوەی ناوەرۆکی فەرهەنگەکە گــران‌بێ بەو وشانەی پێویســت نین . بۆ نموونە دەبینین لــە هەر لاپەڕەیەکدا نزیکەی هەشت وشە هەیە . لەم هەشت وشەیە ، نزیکەی سێ وشەی ناوی دیهاتو شارەکانی کوردستانە ، یەك وشــەی ناوی نایەتی مرۆڤە ، یەك وشەی ناوی شاعێرانو نووسەرانو هونەرمەندانی جیهانە ... بەتایبەتی ئەوەی ئێجگار فەرهەنگەکەی بارگران کردبێ ، وەك وتمان ، ئەوەیە کە نزیکەی لە هەر هەشت وشە ، سیانی ناوی شارو دێهاتەکانی کوردستانە . بە باوەڕی من باشتر وا بوو ، کە گەورەترین‌و بەناوبانگترین شارو دێهاتی هەڵبژاردایە ، کە ژمارەیان ســەد ناوێك دەبێتو ئەوسا فەرهەنگەکەش لەو بارەگرانە ڕزگاری ئەبوو .

هەروەها وەك وتمان ، نووسەر چی زانیوە نووسیوێتی‌و ئەوەی نەشی‌زانیوە بەدوایا نەگەڕاوەو پەڕانوویەتی . ئەمەش بووە بە هۆی هەڵەیەکی زۆر . وەك دەبینین ناوی شاری ( ئۆدێسا )ی داوە ، بەڵام ( تالین )و ( ڤیلنووس )و ( ڕیگا ) ... ی نەداوە ، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمانە پایتەختن‌و ( ئۆدێسا ) پایتەخت نییە .

( قالـه )ی نووسیوه ، بەلام ( بله ) ، ( خـوله ) ، ( ئەجه ) ، ( حەمه ) ، ( عەبه ) ... ی نەنووسیوه .

( پووشـکین ) ، ( پەتهـۆڤن )ی تۆمارکردووەو ( گۆرکی ) ( مایکۆفسـکی ) ، ( بایرۆن ) ، ( چایکۆفسـکی ) ، ( باخ ) ... ی تۆمار نەکردووە .

(بێکەس) ، (خانی)ی نووسیوه ، کەچی (زێوەر) ، (پیرەمێرد) ، (مەولەوی) ، (نالی) ... ی نەنووسیوه .

( اسمهان )ی داوه ، ( جەزراوی ) ، ( شەماڵ ) ... ی نەداوه .

لێرەدا مەبەستم ئەوە نییه ، کە ئەو وشانەی ناوم بردن‌و نووسەر نەینووسیون ، بڵێم ئەبوو بیان‌نووسێ . مەبەستم ئەوەیە کە هەڵبژاردنی وشـه نابێ بەڕێکەوت بێ یا بەپێی زانینی دانەرێ ، بەڵکـو ئەبی بە گوێرەی پێویست بێ . لێکۆڵینەوە ناگونجێ بۆ هەر وشەیەك بە تەنها ، چونکە هەر وشەیەك پەیوەندی لەگەڵ چەند وشەیەکدا هەیە . لەبەر ئەوە نووسـەر ئەبێ بە کۆمەڵ لە وشە بکۆڵێتەوە . بۆ نموونە ، ئەگەر بەکێك بپرسی : پێویست ئەکا ( زێوەر ) لە فەرهەنگدا بنووسرێ ؟ . ئەوە وەڵامی ئەم پرسـیارە ناتوانرێ بدرێتەوە . نەك لەبـەر ئەوەی پرسیارەکە گرانە ، بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕاست نییه . چونکە وەك لـە سەرەوە وتمان ناتوانرێ بووترێ کام وشە پێویسـتەو کام وشە پێویست نییە . دەتوانرێ بووترێ کام کۆمەڵ وشە پێویسـتەو کام کۆمەڵ پێویست نیـیـه . هەروەها دەبێ بزانرێ بۆ چ فەرهەنگێك‌و ئەوسـا دەتوانرێ وەڵام بدرێتەوە .

بۆ ئەم فەرهەنگەی مامۆستا جگەرخوێن هەڵە نییە کە (بێکەس)و ( خانی ) بنووسرێ ، بەڵام کە پێویست بکا ناوی شاعیران‌و نووسەرانی کورد بدرێت ، ئەوسا دەبێ ناوی هەموان یان هەرە بەناوبانگیان بدرێت .

نەك وەك مامۆستا جگەرخوێن ، بێ ئەوەی هیچ هۆو بەڵگەیەك هەبێ ( بێکەس )ی داوەو ( زێوەر )ی نەداوە ، ( خانی )ی نووسیوەو ( مەولەوی )ی نەنووسیوە . بەم جۆرەش بۆ شاعیرانو نووسەران هەمان هەڵەی کردووەو ناوی کامیانی زانیوە نووسیویتی ، بێ ئەوەی نەخشەیەك بکێشێ .

مەبەستم ئەوە نییە کە ( بلە ، خولە ، ئەحە ... ) پێویست بوو لەناو فەرهەنگەکەدا بوونایە ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ، کە ( قالە ) هەبێ ئەوسا ئەبێ ( بلە ، خولە ... )ش هەبێت . دانی ناوی تایبەتی مرۆڤ بۆ ئەم جۆرە فەرهەنگانە ڕاست نییەو پێویست ناکات ، کەچی مامۆستا لەگەڵ ئەوەشدا کورتەی هەندێك لە ناوەکانیشی نووسیوە . بۆ ئەو ناوانە فەرهەنگی تایبەتی هەیە ، هەروەها هیچ پێویستی نەدەکردو ڕاستیش نییە کە ئەم وشانە : سام ، حام ... هتد . کەوتوونەتە ناو « فەرهەنگا کوردی »یەوە .

یاخود چ پێویست دەکا لەم فەرهەنگەدا ( اسمهان ) هەبێ . کە نووسەر ئەم ناوەی داوە ، ئەوە دیارە بڕیاریداوە ناوی گۆرانیبێژان پێویستە لەناو فەرهەنگەکەدا بێ . بەم جۆرە بوایە دەبوو ناوی هەموو گۆرانیبێژانی بەناوبانگ بکەوتنایە ناو فەرهەنگەکەوە . ئەمەش ڕاست نییە . ئەگەر ڕاستیش بیت لە تواناتادا نییە ، چونکە ژمارەی گۆرانیبێژانی جیهان دوور نییە بگەنە تێکڕای ژمارەی ئەو وشانەی لە فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەرخوێندان .

هەندێك وشە کەوتوونەتە ناو « فەرهەنگا کوردی »یەوە ، وەك : باتا ، بیبسی کۆلا ، تایت ، پالاس ... هتد ، کە وایزانم پێویست بەوە ناکات پیشانی بدەمو ڕوونیبکەمەوە ، کە نەئەبوو بە هیچ چەشنێك ئەم وشانە بکەوتنایە ناو فەرهەنگەکەوە . هەرکەس چاوی بەم وشانە

بکەوێ ، بێ‌لێکۆڵینەوە دەزانێ ، بوونیـــان لەناو فەرهەنگەکـــەدا بێ‌سوودە . نەك تەنهـــا بێ‌سوودە ، بەڵکـــو بە خـۆڕایی باری فەرهەنگەکەیان گرانکردوو ..

لە هەڵبژاردنی وشە بۆ « فەرهەنگا کوردی » کەم‌وکوڕی ئێجگار زۆرەو لە وتارێکی وەها کورتدا توانا نییە لە هەمووی بدوێم . ئەوەی ڕاستی بێ ، ئەوەیە وشەکانی ئـەم فەرهەنگە بەتەواوی لەگـەڵ ئەو مەبەستەدا ناگونجێ کە نووسەر بۆ نووسینی فەرهەنگەکەی هەیبووە . دەبینین ژمارەی وشەکانی بەرگی یەکەم‌و دووەمی فەرهەنگەکە لــە شەش هەزار وشە تێ‌ناپەڕن . با بڵێین ژمارەی وشەکانی بەرگی سێیەمیش کە ماوە چوار هەزار وشەیەك دەبێت . بەم جۆرە هەموو وشـــەکانی « فەرهەنگا کوردی » دەکاتە دە هەزار وشەیەك . وەك لــە سەرەوە باسمانکرد پتر لە نیوەی وشەکانی لەگەڵ مەبەستەکەیدا ناگـونجێن ــ واتە ئەو وشانەی کە دەگونجێن نزیکەی پێنج هەزارێك دەبن . جا بۆ مەبەستێکی وەها ــ بۆ قوتابیانی خوێندنی بەرز ــ پێنـج هەزار وشە زۆر کــەمە .

لە لێکۆڵینەوەی وشەکانی ئەم فەرهەنگەدا دەرئەکەوێت ، کــە « فەرهەنگا کوردی » شێوەی ئینســـکلۆپیدیای هەیە ( هەرچەندە نووسەر لە پێشەکیەکەیدا ئەمەی نەنووسیوە ) ، بەڵام لەگەڵ ئــەم مەبەستەشدا ناگونجێ ، چونکە ژمارەی ئەو وشانەی کە پێویستە لــە فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیای کوردیدا تۆماربکرێن ، نەك دەبێ دە هەزار وشەیەك بێت ، بەڵکو دەبێ چەند دە هەزارێك بێ .

× × ×

لە چۆنیەتی لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی مانای وشەدا ناتەواوی زۆرە . بۆ ئەو وشانەی دەتوانرێ مانایان بە یەك وشە نیشانبدرێ ،

نیشانی نەداوە ... زۆر وشە هەن ، کە خاوەنی یەك مانان ( یاخـود مانایان لـەیەك نزیکە ) ، بەڵام شـێوەی نووسینو خوێنـدنەوەیان جیـاوازە ( Synonym ) ، وەك : ( زار ــ زمان ) ، ( قەفقاس ــ قەوقاس ) ، ( هەمیشە ــ هەردەم ــ هەرچاخ ) ... هتد . بۆ دانی ماناى ئەم جۆرە وشانە باشترین ڕێگا ئەوەیە ، وشەی یەکەمیان ( یاخود هەرە ناسراویان ) ڕاڤەبکرێو لەبەردەم ئەوانیتردا بنووسرێ : بڕوانە فلاَن وشە . خۆ ئەگەر جیاوازییەکیش لە نێوانیـاندا هەبێت بنووسرێت .
بەڵام مامۆستا جگەرخوێن بەم شێوەیەی نەکردووە ، بەڵکـو هەموو وشەکانی ڕاڤەکردووەو جگە لەوەش درێژەی بە ڕاڤەی وشەکان داوە . بێگومان ئەو دووبارەکردنەوەیە نەك هەر ڕێگا درێژ ئەکاتەوە ، بەڵکو نیشانی خوێنەریش نادات کە ( زار )و ( زمان ) خاوەنی یەك مانان . بەڵێ بۆ ماناى چەند وشەیەکی کەم لەسەر ئەو ڕێگایە ڕۆیشتووە کە لە سەرەوە باسمانکردووە ، بەڵام ئەویش بە جۆرێك ئاڵۆزی کردووە ، کە لەو باوەڕەدام هێشتا باشتر بوو هەردوو وشەکە ڕاڤەبکات . هاتووە وشەی یەکەمیانی ڕاڤەکردووەو کە هاتۆتە سەر وشەی دووەم لە نێوان دوو کەواندا بە عەرەبی نووسیوێتی ( قد مرت تفسیرها ) . جا گەلێك جار وا ڕێدەکەوێ کە وشەی دووەم لە یەکەمەوە زۆر دوورەو خوێنەر دەبێ بە هەموو فەرهەنگەکەدا بگەڕێ تا وشەی یەکەم دەدۆزێتەوەو دووریش نییە هەر نەیدۆزێتەوە ، چونکە نووسەر لای وشەی یەکەمەوە نەینووسیوە کە وشەی یەکەم کامەیە . لێرەدا وەك مەتەڵی لێدێتو خوێنەر کە وشەی دووەم دەبینێ ، دەبێ بگەڕێو بیربکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێ چی وشەیەکیتر هەیە ماناى وەك ئەم وشەیەی دووەم بێت . جگە لەوە جێگای سەرسوڕمانە ، کە دانەری فەرهەنگێکی کوردی ــ کوردی لە جێگای وشەیەك یان ڕستەیەکی کوردی بۆ ئەو مەبەستە بە عەرەبی بنووسێت : ( قد مرت تفسیرها ) .

ڕاسته فەرهەنگ‌نووس دەبێ گرنگی بەوە بدات کە ڕاڤەی وشەکان بە کورتی بکات . بە مەرجێك ئەو کورتیە نەبێتە هۆی نەکردنەوەو ئاشکرا نەبوونی مانای وشەکان[۱۲] . جگە لەوە پێویستە ڕاڤە ڕوونو ڕەوان بێتو وشەی ئاسانو سادەی بۆ بەکاربهێنرێ تا هەموو خوێندەوارێك بەبێ جیاوازیی پلەی خوێندەواری تێی‌بگات . مامۆستا جگەرخوێن بەم جۆرەی نەکردووە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە بۆ ڕاڤەی بەشی زۆری وشەکان درێژەی پێداوە . بۆ نموونە ، ئەوە وشەی ( سام ) بەو شێوەیەی لە « فەرهەنگا کوردی »دا نووسراوە ، ئەخەمە پێش‌چاو :

( سام )
دبێژن :ـ یەك ژ چار کورێن ( نۆح ـ نوح ) .
پەیغام بەرە :ـ سام ، حسام ، ایرەج ، تورەج . لێ ئەز باوەرناکم . ژ بەرکو مرۆڤ هەمو یەك بەرچەیە . نە سامی هەیەو نەحامی‌و نە توری‌و نە ایرانی . ژ هەڤ جودابونا مرۆڤا تەنی ب زمانو جیگەهە . جارنا ملەتەك نەوەکهەڤیا زمان یا ئۆل یا ژ هەڤ دوربون ، دبن چەند ملەت . و جارنا چەند ملەتێ دژمنی هەڤ بڤی آوایی دبن یەك ملەت . بەلام آورا نژادی ، ورەنگ دمرەون .

ء ـ ( سام ابن نوح ) .

( سام )
ناڤی گەرناسەکی کوردە کالكو باپیری ( روستەم ) ێ ناڤدارە .
دبێژن :ـ روستەم کوری زال کورێ سام کورێ نەریمان .
( شەرەف خان ) . دبێژی :ـ ئەڤ روستەم کورد .
د شەهنامێ دە چەند پەندو بەستە هاتنە :

یەکی جامو بادە
روستەم سوبەرد
بەوی گوڤتی کەی نامێ
بەرداری گورد
بگۆیەدکی گوردان
تەرا خاستەند
سەری تەختی ایران
بیاراستەند

---

(۱۲) ئا . ك . بەرۆنکۆڤ ، لە تەجروبەی فەرهەنگ‌دانانەدا ، « گۆڤاری فەرهەنگ‌نووس » ، مۆسکۆ ، ۱۹۵۷ ، ب ۱ ، ل ۱٤۰ . ( بە زمانی ڕووسی ) .

سید حسین موکریانی دبێژی :ــ
گوتنا ( گورد ) د فردە ( کوردە )و
ڤێ چیرۆکێ دورو درێژ بدارفە
دکی . وهــا رەنگە هــن تاریخ
بێــژین رۆژآڤاو رۆژهــلات

دبێژن :ــ
( کــورد ) ژ ( گــورد ) بداخوازا
گەرناس هاتیە .
ء ــ (اسام جد روستم المشهور) .

دەبینین ڕاڤەی ئەم وشەیە یەك لاپەڕەی تەواوی لە فەرهەنگەکە داگیرکردووە . چ پێویست بەم داستانە ئەکات ؟ لەو باوەڕەدام ، کە ئەم وشــەیە هەر پێویستی بەوە نەدەکرد بکەوتایە نــاو فەرهەنگەکەوە . ئەگەر پێویستیشی بکردایەوە ، ئەوە دەتوانرا بــە دوو دێڕێك بــە ئاسانی ڕاڤەبکرێ .

وشەی ( آلەقەمش ) لە « فەرهەنگا کــوردی »دا بەم جۆرەی خوارەوە ڕاڤەکراوە .

( آلەقەمش )

گوندەکە دسینۆرێ کوردســتانا سۆریەو کوردستانا ترکیا دەبە . پشتی شەرێ ( شیخ ســعید ) د سالا ١٩٢٥ دە حاجو آغا د سالا ١٩٢٦دە لە پهلانینە کە بچــوك چێکرو ژ چیاێ هەڤیرکا داکەتە سوریە . لەشکرێ ترکا د گوندێ ( آلــەقەمشێ )دە ٢٤٣٢ مرۆڤ د حەوشــا آغی دە کوشتن‌و

شوتاندن . ژن‌و مێرو زارۆك ب هەڤرە بون . من ب چاڤێ خوە ژنەك دی کو هەر بتــەنێ ژ بەر سنگوا پاراستنی مابو . لێ خوین ژ پشتا وێ دهات من پیرا تۆرێ ل سەر ڤێ ژنکێ چێکــریە .
( آلەقەمش ) ــ آلەقماشــە .
آلاوی قماش بو .
ء ــ (اسم لقریة کوردیە مشهورة)

لەو باوەڕەدام ( آلەقەمش ) زۆر بە باشی دەتوانرا بە چەند وشەیەك ڕاڤەبکرێ‌و پێویستیشی بەم درێژەپێدانە نەئەکرد .

ئنجا با تەماشای وشەی ( ترك ) بکەین ، بەو شێوەیەی ، کــە مامۆستا جگرخوێن ڕاڤەی کردووە .

نافی ملەلـەتەکی‌یە ژ چێنێ تـا
سـنیۆرێ یەونانو بلقـــار درێژ
بونـــە . عنك درێژێ رۆژهلاتێ
یەکتیا سۆفیاتی دە دژی ، تەنی
ملەلەتێ کـــورد نافــیرا ترکێ
آزەربایجانو ترکی ترکیا دبری .
ژ لـــەورا ترکێ ( طـــورانی )
کمالیسـت خـستوتە دلێ خوە کۆ
ملەلەتێ کورد بزۆر بکـن ترك .
داوەکو ترکستانە کـــــە مەزن
لدارخن . لێ دقــــرنێ ( ٢٠ )
بیستا دە ئەڤ داخوازا پێـــك
نایێ . ژ بەرکۆ زۆر نەما بکارێ.
مللەت هەمو شیار بونە .

خوێنەر کە چاوی بە ڕاڤەی وشەی ( ترك ) دەکەوێ ، وا دێتە بیری ، کـــە مامۆستا وتارێکی لەبارەی مێژووی تورك‌و جوولانەوەی تۆرانەوە نووسیوەو دوور نییە لەبیر خوێنەر بچێتەوە ، کە فەرهەنگی بەدەستەوەیەو ویستوویەتی بزانێ مانای وشەی ( تورك ) چییە . ئەم وشـــەیەش هەر وەك ئەوانی پێشـــوو ، دەتوانرا بە چەند وشـــەیەك ڕاڤەبکرێ .

بۆ تەواو سەلماندنی ئەو باوەڕە ، کە مامۆستا جگەرخوێن زۆر درێژەی بە ڕاڤەی وشەکان داوە ، وا وشەی ( خانی )یش بەو شێوەیەی مامۆستا ڕاڤەی کردووە دەخەینە پێش‌چاو :

( خانی )

ناف و دەنگی شاعرەکی نافداری
کوردە کـــۆ دوەلات پارێزی دە
یەکەم مرۆڤە د کوردســـتانێ دە
تاریخ‌و ژینکاریا ســــــەیدایێ
( خانی ) دناف روپەلێ تاریخـــا
مێژوێ کوردو هۆزانی دە جیکی
بلند گرتیە . دەما ( خانی ) بنافی
وەلات پارێزی گازی دکـــــر ل
( فرانسـا ) بکێـــرا ول‌ویرو و
کەنشـتا زکێ هەڤ دچرانـــدن .
لێ مەخابن ! ملەتی کـــورد نە
شیارو اگادار بو بهائی نفیـــسینا
خانی نزانبو . بەر ب نەوالا بن
دەســتی فە بەرژێر دبو .
« ( اسم اعظم شـاعر کوردی ) .

نووسەر باسی خەبات‌و مێژووی ژیانی ( خانی )ی کردووە ، کە هیچ پێویستی بەم باسە درێژە نەئەکرد ، چونکە ( خانی ) لە فەرهەنگدا باس‌کراوە ، نەك لە مێژوو یان ئەدەبدا ٠ جا گەر مامۆستا مەبەستی ئەوە بێت ، قوتابیانی بەشی کوردی بەم باسە ( خانی ) باش بناسن‌و شارەزایی لەبارەیەوە پەیدابکەن ، ئەوە ئەم باسە بۆ ئەو قوتابیانە کەمە ٠ ئەوان سەبارەت بە ( خانی ) دەبێ زۆر بزانن ، نەوەك تەنها ئەو چەند دێرە ٠ بۆ زانینی باسی ( خانی )یش ئەدەب هەیە ، کە لەو زانستەدا دەتوانن باش بیناسن ٠ فەرهەنگ ئەو ڕێگاو ئەو توانایەی نییە بە درێژی باسی هەموو شتێك بکات ، بەڵکو دەتوانێ بە کورتی دەری‌خات ، کە ( خانی ) کێیە ٠ بۆنموونە ، دەتوانرا بنووسرێ ٠

خانی ــ شاعرەکی کوردە ، ل قەرنا حفلدا ئما ، ڤیسکارێ مەم ئو زینە .

لەو باوەڕەدام گەر مامۆستا جگەرخوێن ڕاڤەی ( خانی ) بەو شێوەیەی من کردوومە ، بکردایە باشتر بوو ٠ ئەگەر خوێنەر بەو ڕاڤەیەدا باش بۆی ڕوون نەبێتەوە یا بیەوێ پتر دەربارەی ( خانی ) بزانێ ، ئەوە بە ئاسانی دەتوانێ تەماشای مێژووی ئەدەبی کوردی بکاو بۆی ڕوون‌ببێتەوە ، ئەو شاعیرە کێیە ، کە لە سەدەی حەڤدەدا ژیاوەو مەم‌و زینی نووسیوە ٠

سەرەڕای ئەو درێژەپێدانەی لە سەرەوە باسمان‌کرد ، دەبینین مامۆستا جگەرخوێن لە هەندێ شوێندا بۆ ڕاڤەی وشەیەك هەڵبەستێکی دوورو درێژی هێناوەتەوە ٠ لەو باوەڕەدام پێویست بەوە ناکات بۆ دۆزینەوەو تێگەیشتنی مانای وشەیەك ، خوێنەر کاتێکی درێژ بەرێتەسەرو بکەوێتە بیرێکی قووڵەوە ٠ هەروەها دەبینین لە هەندێ شوێندا هەڵبەستێکی وای بۆ ڕاڤەی وشەیەك داوە ، کە نەك ئەو

هەلبەستە مانای وشـــەکە ڕوون ناکاتەوەو نیشان نادات ، بەلکـــو بەپێچەوانەوە ئالۆزی ئەکاو دەیکاتە مەتەلێـــكو خوێنەر دەخـــاتە بیرکردنەوە بۆ هەلهێنانو تێگەیشتنی • لەبەر ئەوە فەرهەنگ نووس دەبێ ئاگای لەوە بێ چ شێوەو شێوازێك ئاسانترە بۆ ڕاقەی وشەو بۆ زووترو باشتر تێگەیشتنی خوێنەر تا ئەو ڕێگایە بگرێت • لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە ، کە ڕاقەی وشە بە هەلبەست ناکرێ ، بەلکو دەلێم دەکرێت • بەلام بە مەرجێك بە دوو دێڕێکی سادە ، کە بە جوانی مانای وشەکەی تیادا بکرێتەوە • نەوەك بە هەلبەستێکی درێژ کە مانای وشەکەی تیادا ... بێو بێ کەلك جێگا لە فەرهەنگەکەدا داگیربکاتو کات لە خوێنەر ... بکات •

بەلێ مامۆســـتا ڕاقەی هەندێ وشـــە بە کـــورتی ئەکا ، بەلام مەرج ئەوە نییە ڕاقە هەر کورت بێ ، بەلکو مەرج ئەوەشـــە ڕاقەکە بە تەواوی مانای وشـــەکە یەکالا بکاتەوەو خوێنـــەر بە باشیو ئاسانی تێیبگا ••• بۆ نموونە مامۆستا وشەی ( دینار )ی بەو جۆرەی خوارەوە ڕاقەکردووە :

( دینار ) بیست دەرهەمە •

بێ گومان باشە کە خوێنەر بزانێ دینار بیست درهەمە ، بەلام بەم ڕاقەیەدا ئاشکرا نەبووە دینار چییە • لەگەل ئەوەشدا خۆ دینار هەزار فلسە ، چوار چارەکە ••• و ( دینار )ی یۆغۆسلافییش هەیەو ئەی ئەو چۆن بەش ئەکرێت ؟••• بەو پێیە دەبوایە نووسەر ئەمانەش بنووسێت • لەڕاستیدا بۆ فەرهەنگ ئەمانە پێویست نین ، بەلکو پێویست ئەوەیە نیشان بدرێت ( دینـــار ) دراوی چ ولاتێکە • هەرچەندە لـــە ڕاقەی ( دینار )دا ناتەواوی هەیە ، بەلام تا ڕادەیەك وشەی ( دۆلار )ی باش ڕاقەکردووە ، کە نووسیویێتی : پارە ئی ئەمەریکاتە •

ڕاڤەی نارێكو ناقۆلاّ بە باسی بێسوودو بە هەڵبەستی گرانو ...
نزیكەی لە هەموو لاپەڕەیەكی فەرهەنگەكەدا دەبینرێ . تا ڕادەیەك ئەمە جێی سەرسوڕمان نییە ، بەلاّم لە چەند شوێنێكدا ڕاڤەی هەندێ وشەی بە جۆرێ كردووە ، كە هەڵەی وەها گەورە نەدەبوو بكرایە .
بۆ نموونە ڕاڤەی وشەی ( پالاس ) لە « فەرهەنگا كورد »دا بەم جۆرەی لای خوارەوە كراوە :

( پالاس )

ناڤێ ئۆتێلەكێ یە . ل گەلەك باژار
ئەڤ ناڤ هەیە . نە كوردیو
عربی یە .
ء – ( اوتیل پالاس )

مامۆستا دەڵێ ( پالاس ) ناوی میوانخانەیە . جا چۆن وەها مانای وشە ئەدرێت ؟ چۆن وشە وا ڕاڤە ئەكرێت ؟... ئەگەر بەو چەشنەی مامۆستا جگەرخوێن ڕاڤەو مانای وشە نیشان بدرێت ، خۆ ئەشێ ( پالاس ) ناوی چێشتخانەو چایخانەو سینەماو ... هتد بێت . خوێنەر چاوەڕوانی ئەوە لە فەرهەنگنووس ناكات ، بزانێ ( پالاس ) میوانخانەیە ... بەڵكو چاوەڕوانی ئەوە ئەكات بزانێ ( پالاس ) چ مانایەك ئەبەخشێت . ئەگەر بە گوێرەی ڕاڤەی مامۆستا جگەرخوێن بێت ، ئەوە زوربەی وشە بێ مانان . بەم جۆرە بوایە ، كە دانەری « فەرهەنگا كوردی » مانای وشە ئەدات ئەوە ئەبوایە بۆ مانای وشەی ( كوردستان )یش هەر بینووسیایە ناوی میوانخانەیە ، بۆ مانای وشەی ( گۆیژە )ش بینووسیایە ناوی سینەمایە ، بۆ مانای وشەی ( مفتی )یش بینووسیایە ناوی گەرماوە ، بۆ مانای وشەی ( سلێمانی )یش بینووسیایە ناوی كەبابخانەیە ... هتد . لەو فەرهەنگە كوردییانەدا ، كە تاكو ئێستا دەرچوون لەم چەشنە ناتەواوییانەم تێدا نەدیون .

ئەو هەموو وشـــانەی نەدەبوو بکەونە نـاو فەرهەنگەکەوەو کەوتوونەتە ناوی ، لەگـــەڵ ئەو ڕاڤە دوورو درێژانەو هەڵبەستانەی بێسوود نووسراون لابیرانایە ، ئەوسا بە ئاسانی دەتوانرا ئـەو دوو بەرگەی « فەرهەنگا کوردی » بە یەك بەرگ لە چاپبدرێتو چ بۆ باری چاپو چ بۆ خوێنەر باشتر بوو .

× × ×

مامۆستا جگەرخوێن بۆ ڕیزکردنی وشەکان ئەو ڕێگایەی گرتووە کە هەندێ لە فەرهەنگە فارسییەکانی کۆن لە سەری ڕۆیشتوون ــ واتە بە گوێرەی پیتی سەرەتاو کۆتاییە . ئەم ڕێگایە تا ڕادەیەك ئاڵۆزەو دۆزینەوەی وشە گرانە . لەبەر ئەوەیە کە لە فەرهەنگەکەی مامۆستا جگەرخوێندا گەڕان بۆ وشەیەك ونبووێکە لە فەرهەنگەکەدا . ئـەم جۆرە ڕێگایە لەبەر ئاڵۆزی لەمێژە وازی لێهێنراوەو نازانم هۆی چییە مامۆستا جگەرخوێن بەم چەشنە کردوویەتی . هەروەها « فەرهەنگا کوردی » تاکە فەرهەنگی کوردییە ، کە ئەم ڕێگا ئاڵۆزەی گرتووە . بۆ نموونە ، دەبینین لە فەرهەنگەکەدا وشەی ( ڕۆژ ) لە لاپەڕە (١٤٩)دایەو کەچی ( ڕۆژی ) ، کە ئەبێ لە پاش ( ڕۆژ ) بێت ، لە لاپەڕە ( ١٤٧ )دایە . ( پۆلیس ) لە لاپەڕە ( ١٧٢ )دایەو ( پۆلیسخانە ) ، کە ئەبێ لە دوای وشەی ( پۆلیس )ەوە بێت ، لە لاپەڕە ( ١٦٧ )دایە ... هتد . واتە ئەم ڕێگایە بووە بە هۆی پاشو پێش خستنی وشەکان .

هەرچەندە لە « فەرهەنگا کوردی »دا ناتەواویو کەوم کورتی زۆرە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتی بەکەڵكو باش هەیە . گەلێك وشەی پێویست لەناو فەرهەنگەکەدانو زۆر وشە جوان ڕاڤەکراون . دیارە کە مامۆســـتا شارەزاییەکی باشی لـە زمانی کـوردیو مێژووی کوردو کوردستاندا هەیە .

مەبەست لەم وتارە ئەوە نییە لە نرخی مامۆستا جگەرخوێن کەم بکرێتەوە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو کەم و کورِییانەی لە کاری فەرهەنگنووسیی کوردیدا هەن بخرێنە بەرچاو ، تا فەرهەنگ نووسەکانمان سوودی لێ ببینن بۆ ئەو فەرهەنگانەی بەدەستەوەن • بۆ پێشخستنی ئەم زانستەش ئەو رێگەیەمان گرتووە کە لێنین پەنجەی بۆ راکێشاوە : « هەر زانستێك پێش دەکەوێ و گەشە دەکا گەر لەسەر بناغەی زانینی مەردوم دارِێژرابێت و لەسەر بنکەی رەخنەو روونکردنەوەو تێگەیشتنی هەموو ئەوەی لە زوودا کراوە هەڵچنرابێت »[13](*) •



(13) ف . ئی . لینین ، « مارکس ، ئینگلس ، مارکسیزم » ، مۆسکۆ ، ١٩٤٧ ، ل ٤٥٧ ( بە زمانی رووسی ) •

(*) بروانە : رۆژنامەی « هاوکاری » ، ژ ١٢٧ و ١٢٨ ، بەغدا ، ١٩٧٢

# چەند سەرنجێك دەربارەی

# «زاراوەی پارێزگای ســـلێمانی»

ئەم وتارە لــە مانگی ئابی ١٩٧١ لــە شــاری لێنینگراد نووسراوەو نێرراوە بۆ عێراقو لــە پۆستەدا ونبووە . هەرچەندە ، سەبارەت بەم فەرهەنگۆکە چەند وتارێك بلاوکراوەتەوە ، بەلام لەگەل ئەوەشدا وای بە باش دەزانین ، کــە ئێستــا بێ هیچ دەستکارییەك بلاوی بکەینەوە .

**ـ نووسەر ـ**

مێژووی دارشتنو دانانو دروستکردنو دۆزینەوەو وەرگێرانی زاراوە لە زمانی کوردیدا دەگەرێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم . تا سالانی ٦٠ ئەم کارە بە شێوەیەکی سستو سادەو ســاکار بوو . بەرهەمی ئەم دەورە بریتییە لــە فەرهەنگۆکەکەی ف . نیکیتین[1] ، فەرهەنگۆکی زاراوەی زانسیی ئەرمەنی ـ کوردی ، کــە لــە سالی ١٩٣٥ لە یەریڤان چاپکراوە ، لیســـتەی ئەو زاراوە کۆمەلایەتیو سیاسییانەی لە گۆڤاری « هاوار »دا ( سالی ١٩٣٠ ) بلاوکراونەتەوە لە بەشێکی تایبەتیدا لەژێر نــاوی « فەرهەنگۆك »دا ، هەروەها ئــەو زاراوانەی لــە « گەلاوێژ ، ژین ، دەنگی گێتی تــازە ، هەتــاو ، نیزار ... »دا خراونەتە بەردەم خوێنەواران .

---

(١) ف . نیکیتین ، زاراوەی جــەنگی رووسی ـ کــوردی ، ورمێ ، ١٩١٦ .

دەوری دووەم لە شۆڕشی چواردەی تەمووزەوە دەست‌پێ‌دەکا تا ئەمڕۆ . بەرهەمی ئەم دەورە بریتییە لە : ئەو زاراوە زانستی‌یانەی لە لایەن چەند لیژنەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دانراوەو داڕێژراوەو لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »ی ساڵی ١٩٦٠دا بڵاوکراوەتەوە . ڕاستە لە وەرگێڕانو داتاشینی ئەم زاراوانەدا ناتەواوی‌و کەم‌وکورتی ئێجگار زۆرە ، وەك لە وتارەکەی مامۆستا جەمال نەبەزدا[٢] ، کە لە زاراوەکانی لیژنەی ( ریاضیاتی ) گرتووە خراونەتە پێش‌چاو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەرهەمە دەوری خۆی بینیوەو دەبینێ . دوابەدوای ئەم زاراوانە لە لایەن نەقابەی مامۆستایانی سلێمانی‌یەوە « فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی » دەرچوو ، کە ٩٧ لاپەڕەیە[٣] . لە زاراوەکانی بەشی جوگرافیا مامۆستا غەفوور ڕەشید کۆلیوەتەوەو ڕەخنەی بەجێی گرتووە[٤] . هەر لە ساڵی ١٩٦٠دا مامۆستا جەمال نەبەز لەژێر ناوی « هەندێك زاراوەی زانستی »دا[٥] فەرهەنگۆکێکی لە چاپ‌داو چەند کەم‌وکورتییەکی کەم لە کارەکەی مامۆستا نەبەزدا هەیە . ڕاستە ژمارەی وشەکانی فەرهەنگۆکەکەی نزیکەی ( ٣٠٠ ) وشەیەکەو بۆ ئەم مەبەستە

---

(٢) جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ریاضیات لەژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ساڵی ١٩٦٠ ، ژ ٦ ، ل ١٠٢ – ١٠٩ ؛ ژ ٧ ، ل ١١٢ – ١٢١ ؛ ژ ٨ ، ل ٨٥ – ٩١ .

(٣) غەفوور ڕەشید ، سەرنجێك لە بەرآوی زاراوەی زانستی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ساڵی ١٩٦٠ ، ژ ١٢ ، ل ٢٧–٣٥ .

(٤) ئەم دوو وتارە ، بەتایبەتی وتارەکەی مامۆستا نەبەز لەسەر شێوەیەکی زانستی نووسراونو لە لێکۆڵینەوەکەیاندا گەلێ ڕاستی‌یان نیشانداوە . لەو باوەڕەداین کە لە دانانی فەرهەنگۆکی « زاراوەی بارێزگای سلێمانی »دا پێویست بوو سوود لەم وتارانە وەربگرن .

(٥) جەمال نەبەز ، هەندێك زاراوەی زانستی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .

کەمە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــــدا بەرهەمێکی زۆر پوخــتو کارێکی سەرکەوتووە[٦] .

دوای بڵاوبوونەوەی ئەو چەند بەرهەمەی لە سەرەوە ناومانبردن ، ماوەی دە ساڵێك لەم ڕووەوە هیچ شتێکی وەها لە چاپ نەدراوە کــە شایانی باس بێت . بەڵام لە ڕێکەوتنە مێژووییەکەی مارتی ١٩٧٠وە هەســت بە بزوتنــــەوەی ئەم کارە دەکەین : یەکـــــەم بەرهەمی ئەم بزووتنەوەیەش ئەو فەرهەنگۆکەیە کە چەند مانگێك لەمەوبەر لەژێر ناوی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »دا لە چاپ دراوەو کە سەرباسی ئەم لێکۆڵینەوەیەمانە .

× × ×

چەند مانگێــــك لەمەوبەر لە لایــەن لیژنەیەکی تایبــەتییەوە فەرهەنگۆکێك ، کە بریتییە لە کۆمەڵە وشــــەو زاراوەی عەرەبی ـــ کــوردی ، لەژێر ناوی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »دا لــە چاپ درا[٧] . ئەم فەرهەنگۆکە « بە مەبەستی نووسین لە نێوان فەرهەنگو دامو دەزگاکانی فەرمانی »دا[٨] دانراوە ، کە یەکێکە لــە بەندەکانی بەیانی ١١ی ئازاری مێژوویی .

لە لیژنەی نووسینی ئەم فەرهەنگۆکەدا گەلێك لە زاناو دانــاو کوردناسی شارەزا ، وەك مامۆستایان : شێخ محەمەدی خاڵ ، شاکیر

---

(٦) لێکۆڵینەوە لەو فەرهەنگو لیستەی زاراوانەی لەناو گۆڤارو ڕۆژنامەدا لە چاپدراونو بڵاوکراونەتەوەو کە لە سەرەوە ناومانبردن بە چەند وتارێکی تایبەتی پێشکەشی دەکەین . بەڵام لەم وتارەدا تەنهــا ناوی ئەو کارانەمان هێناوەو لێیان نەدواوین ، چــونکە مەبەستی ئەم وتارەمان لێکۆڵینەوەیە لە فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی » .

(٧) زاراوەی پارێزگای سلێمانی ، سلێمانی ، ١٩٧١ ، چاپی یەکەم .

(٨) هەمان سەرچاوە ، ل ٢ .

فەتتاح ، محەمەد مستەفا کوردی ، محەمەد صالح سەعید ، ڕەئووف ئەحمەد ئالانی ، ئەحمەد هەردی ... هتد ، هاوبەشییان کردووە ، ئەم هێزە گەورەیەش کە کۆبووەتەوە بۆ ئەم مەبەستە ، بووە بە هۆی سەرکەوتنی فەرهەنگۆکەکە ، خوێنەر هەر کە چاوی بە ناوی ئەندامانی لیژنەکە دەکەوێ ئەو هەستە پەیدا دەکات ، کە نووسراوێکی بەکەلك و بوخت و پێویست ... ی لەبەر دەستدایە ، ئێمەش هەر ئەو باوەڕەداین و ئەو هەستەشمان بەرامبەر بە « زاراوەی پارێزگای سلێمانی » هەیە .

فەرهەنگۆکی ناوبراو نزیکەی ( ١٤٠٠ ) وشەیەکی عەرەبی دەبێت ، کە بەرامبەریان ماناکانیان بە کوردی دراوە . وشەکانی ئەم فەرهەنگۆکە بە تەواوی لەگەڵ مەبەستی دانانیــدا ئەگونجێن . بەڵگەش بۆ ئەمە ، ئەوەیە زوربەی ئەو وشانە بەرچاو دەکەون ، کە بۆ نووسین لــە نێوان فەرمانگاو دام و دەزگای فەرمانیدا پێویستن . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ وشەو زاراوە هەن نەکەوتوونەتە ناو فەرهەنگۆکەکەوە ، کە بۆ هەمان مەبەست کەمتر پێویست نین وەك لەو وشــانەی تۆمارکراون . هەروەها هەندێك وشە هەن ، کە بۆ ئەو مەبەستە زۆر پێویــست نین و کەوتوونەتە ناو فەرهەنگۆکەکەوە .

هۆی ئەو کەم و کورتییە کــەمەی کە هەیە لــە هەڵبژاردنی وشــە عەرەبییەکاندا بۆ ئەم فەرهەنگۆکە ئەوەیە ، کە لیژنەکە لەسەر شێوەیەکی زانستی وشــەی کۆنەکردۆتەوەو هەڵنەبژاردووە ، وەك لــە پێشەکیدا نووسراوە :

« بەڕێوەبەریتیی پەروەردەو فێرکردن بە نووسراوی ٧٨٦٥٠ ڕۆژی ٢٠/٤/١٩٧١ داوای لە پارێزگای سلێمانی کرد کە بە فەرمانگەکانی تری ڕابگەیەنێت هەر وشەو زاراوەیەکیان پێویستە بۆ وەرگێڕانی بۆ

کوردی ڕاستەوخۆ بینێرن بۆ لیژنەکەو تا ئێستا لە چەند فەرمانگەیەکەوە زاراوە نێرراوە »[٩] .

لە کۆتایی ئەو چەند دێڕەی پێشەکیی فەرھەنگۆکەکەدا دەرئەکەوێ کە تەنھا لە چەند فەرمانگەیەکەوە زاراوەیان بۆ نێرراوەو لەسەر دڵخوازی ئەو چەند فەرمانگەیە ، ئەو فەرھەنگۆکە دانراوە . بەمەدا دەرئەکەوێ ، کە ئەم نووسراوە سوودبەخشە تەنھا بۆ چەند فەرمانگەیەك ، نەك بۆ ھەمـــوو فەرمانگەکان . بەڵگەش بۆ ئەمە تەنھـــا ئەو چەند دێڕەی پێشەکییەکە نییە ، بەڵکو چاوخشاندنێك بە فەرھەنگۆکەکەدا باشتر ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو . جگە لەوە دوور نییە کە فەرمانبەرانی ئەمڕۆی ئەو فەرمانگەیانە پێویستیان بەو وشەو زاراوانە بێت ، بەڵام ئەگەر پاش ماوەیەك ھەندێك لە فەرمانبەران لە ئەنجامی گواستنەوەدا گـۆڕانو فەرمانبەرانی نوێ پێویستیان بەو وشانە نەبێو پێویستیان بە وشەی کە بێت ، ئەوسا فەرھەنگۆکەکە سوودێکی زۆری لێ‌وەرەناگـیرێو زۆر نازێ . کۆکردنەوەی وشە بەم چەشنە کـە لیژنەی دانانی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی » لە سەری ڕۆیشتووە فەرھەنگۆکەکەی خستۆتە چوارچێوەیەکی تەسکەوە .

بۆ کۆکردنەوەی وشەو زاراوە ، وەك وتمان ئەو ڕێگایە ڕاست نییەو دەبێ بە ھۆی کۆسپو کەم‌وکورتی بۆ فەرھەنگ . باشتر وا بوو ، ئەندامانی لیژنە خۆیان بەسەر فەرمانگەکاندا بگەڕێنو لەناو نووسراوو چاپەمەنییەکاندا وشـەیان دەربھێننو کۆبکەنەوە . جـگە لەوە خۆ فەرھەنگی عەرەبی زۆرە کە بە ئاسانی دەتوانرا وشـــەو زاراوەی پێویستیان بۆ ئەم مەبەستە لێ دەربھێنرێ . ھەروەھـا ڕێگەی‌تر بۆ کۆکردنەوەی وشە زۆرە .

---

(٩) ھەمان سەرچاوە ، ل ٤ ـ ٥ .

پاش ئەوەی وشە کۆدەکرێتەوە ، ئینجا دەبێ بژار بکرێ ــ واتە ئەو وشانەی پێویست نین لابرێن و ئەو وشانەی پێویستن و پەڕێنراون و نین بهێنرێنە ناوەوە • بۆ ئەم مەبەستە چەند ڕێگایەکی زانستی هەیە ، کە وا لە خوارەوە بە کورتی لە یەك دوایێکیان دەدوێین :

١ ــ وشەکان کە کۆکرانەوە بە گوێرەی بابەت دابەش بکرێن بەسەر چەند پۆلێك وشەدا ، هەر پۆلێك لەژێر سەرباسی خۆیدا ، کە پەیوەندی تەواو هەبێت لە نێوان ئەو وشانەی لەیەك پۆلن • بۆ نموونە ، زاراوەکانی کارەبا ، زاراوەکانی فیزیا ، زاراوەکانی ڕێزمان ، ئەو وشانەی پەیوەندیان بە نامەوە هەیە ••• هتد • بەم جۆرە نەك تەنها دەتوانرێ ئەو وشانەی کە نەکەوتوونەتە ناوەوەو پەڕێنراون ، بهێنرێنە ناوەوەو بنووسرێن ، بەڵکو دەتوانرێ وشەو زاراوە کۆبکرێتەوە • ئەگەر بەم ڕێگایەدا بڕۆین ، دەبینین لە هەندێ کەم وکوڕی ڕزگارمان دەبێت • بۆ نموونە ، ئەگەر ئەو وشەو زاراوانەی پەیوەندیان بە ڕێزمانەوە هەیە ، کۆبکرێنەوە ، دەبینین ئەم وشانە کۆدەکرێنەوە : اسم ، صفه ، فعل ، ضمیر ، جملە ، کلمە ، حرف ، مصدر[١٠] ••• و گەلێکی تر • ئەوسا هیچ یەکێك لەم وشەو زاراوانە ناپەڕێنرێن •

بەڵام لە فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »دا دەبینین ، کە ( صفه ، جملە ، کلمە ، مصدر ) هەیەو کەچی ( فعل ، ضمیر ، حرف ••• ) نییە • ئایا هۆی چییە ئەم وشانە پەڕێنراون ؟ گوایا ئەبێ ( فعل ، ضمیر ••• هتد ) کەمتر پێویست بن و کەمتر بەکاربهێنرێن ، وەك لە ( صفه ، کلمە ••• هتد ) •

---

(١٠) بۆیە وشەکان بە عەرەبی دراون ، چونکە لێرەدا باسی کەم وکوڕیی بەشی عەرەبییەکەی فەرهەنگۆکەکە کراوە .

بێشك هۆی هەرە گەورەی ئەم کەموکوڕییە ئەوەیە ، لیژنەکە ئەو ڕێگایەی نەگرتووە کە ناومانبرد ••• هەروەها ئەو وشـــانەی پەیوەندییان بە سەرباسی نامەوە هەیە ، ئەمانەن : ( رسـالة ، طابع ، اوراق ، برید ، حبر ، قلم ••• ) ، بەڵام ئەم فەرهەنگۆکەی لێی ئەدوێین ، ئەم وشـــانە : ( رسالة ، طابع ، اوراق ، برید ••• )ی داوە ، کـەچی ( حبر ، قلم ••• )ی نەداوە ، لەگەڵ ئەوەی ئەم وشانەش هەر بەو جۆرە پێویستن‌و هەر بەو ئەندازەیەش پەیوەندییان بە مەوزووعی نامەوە هەیە • بەم شێوەیە دەتوانین گەلێك وشەو زاراوە بخەینە پێش‌چاو ، کە ئەبوو لە فەرهەنگۆکەکەدا تۆماربکرێن •

٢ ــ لە هەموو زمانێکدا وشە هەن کە یەك چاوگ‌و یەك ڕیشەیان هەیەو لە یەك وشە دەتوانرێ هەندێ وشەی‌تر دروست‌بکرێ ، وەك : ( محافظ ، محافظه ) ، ( فن ، فنان ، فنی ) ، ( شعر ، شاعر ) ، ( ادب ، ادیب ) ••• هتد • جا لەم ڕێگایەوە پاش کۆکردنەوەی وشە ، پێویستە هەر وشەیەك بەجیا تەماشابکرێ‌و بخرێنە پاڵ وشەکان • بێ‌گــومان مەرج نییە لە هەموو وشەیەك وشەی‌تر دروست‌بکرێ‌و یاخود هەموو ئەو وشانە بکەونە ناو فەرهەنگەوە ، بەڵام ئەبێ ئەوە لەبیر نەکرێ ، کە بە کەموکوڕییەکی گەورە دەژمێررێت گەر وشەی ( ادب ، ادیب ، شاعر ) هەبێت‌و ( شعر ) نەبێت •

لەم بارەیەوە لە « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »دا کەموکورتی دەبینرێ • بۆ نموونە ، دەبینین وشەی ( فنی ) هەیەو کەچی ( فنّ ، فنان ) نییە ، ( ادب ، ادیب ، شاعر ) هەیەو بەڵام ( شعر ) نییە ••• هتد •

جگە لەوەی باســمانکرد ، بۆ کۆکردنەوەو بژارەی وشـــە بۆ فەرهەنـــگ هەندێ ڕێگای زانســـتی تریش هەیە • هەروەها لـــەم ڕێگایانەشەوە دەتوانرێ ڕەخنــــە بگیرێ‌و ناتەواوی‌و کـــەموکوڕی

نیشان‌بدرێ • لەو باوەڕەداین ، کە بەو باسە کورتەی سەرەوەدا هەندێ کەم‌وکوڕی بەشی عەرەبی فەرهەنگۆکەکەمان خستۆتە پێش‌چاو •

ئەو جۆرە کەم‌وکوڕییانەی باسمان‌کردن لـــە زۆر فەرهەنگدا دەبینرێن‌و دوورکەوتنەوە لێیان ئاسان نییە • بەڵام هەندێ ناتەواوی هەیە مەگەر بەدەگمەن هەڵەی وەها بکرێ‌و بەئاسانی دەتوانرێ ئـەو جۆرە ناتەواوییانە چارەبکرێ • کەچی بەداخەوە لەم فەرهەنگۆکەدا ئەو چەشنە کەم‌وکوڕی‌یانەش بەرچاو ئەکەون ، کە نەدەبوابە ببوونایە •

یەکێك لەو ناتەواوییانە ئەوەیە ، گەڕان بە شوێن وشـــەیەکدا ونبوو‌تێکە لەناو فەرهەنگەکەدا • ئاشکرایە ، کـــە بۆ ئەم جۆرە فەرهەنگانە دەبێ وشەکان بە گوێرەی ئەو زنجیرەیەی کە هەیە لـــە ئەلفوبێی عەرەبیدا ڕیزبکرێن تا خوێنەر ئەو وشەیەی پێویستێتی بە ئاسانی بیدۆزێتەوە • لەم بارەیەوە لە فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »دا هیچ ڕێك‌وپێکی‌یەك نییە • بە گوێرەی وشـــەکانی ئەم فەرهەنگۆکە ، دەبوایە پاش وشـــەی ( اساس ) یەکسـەر ( اساسی ) بنووسرایە ، بێ ئەوەی هیچ وشەیەك لە نێوانیـــاندا هەبێت ، کەچی دەبینین پاش وشەی ( اساس ) چل‌و دوو وشە نووسراوەو ئینجا تۆرە هاتۆتە سەر وشەی ( اساسی ) • بەم شێوەیە ، ئەگەر خوێنەر بە دوای وشەی ( اساسی )دا بگەڕێ ، دوور نییە بەرچاوی نەکەوێ ، چونکە ئەگەر پاش وشەی ( اساس ) وشـــەی ( اساسی ) نەبینێ ، ئەوە وا تێدەگات کە وشەی ( اساسی ) لە فەرهەنگۆکەکەدا نییە ••• دەبوایە وشەی ( اختصاصی ) لـەپاش ( اختصاص )ەوە بنووسرێ ، کـەچی نەك هەر وشەی ( اختصاصی ) خراوەتە پێش ( اختصاص ) ، بەلکو لەپاش وشەی ( اختصاصی ) شەست‌و هەشت وشە نووسراوەو ئنجـا وشەی ( اختصاص )لکراوە • ( دار المعلمات ) نەك هەر خراوەتە پاش

( دار المعلمين ) ، بەڵکو سیازدە وشەش لە نێوانیاندا دانراوە • ( حساب ) نەك هەر خراوەتە پاش ( حسابات ) ، بەڵکو دوازدە وشەش لە نێوانیاندا ڕیزکراوە • ( ترفیع ــ راتب ) ، ( ترفیع ــ فی المنصب ) ، ( ترفیع ــ في الدرجه ) نەك هەر لە یەکەوە دوور دانراون ، بەڵکو هەر یەکەیان لــە سووچێكو لاپەڕەیەکدان • وشەی ( ابلة ) نەك تەنها لە دوای وشەی ( ابداع )ەوە نەنووسراوە ، بەڵکو چوار لاپەڕە لەیەك دوورن • با بڵێین ئەمە بۆ خوێنەر هێشتا زۆر گران نییە ئەگەر بۆ وشەیەك بگەڕێ ، کە بە پیتی ئەلف دەست پێ‌بکا هەموو ئەو وشانە بخوێنێتەوە کە سەرەتایان بە پیتی ئەلف دەستپێ‌کراوە • بەڵام بە هیچ چەشنێك ڕاست نییە کە ( تفتیش ، مالیه ، موسم ، مختبر ••• هتد ) بخرێنە ناو ئەو کۆمەڵە وشانەی پیتی یەکەمیان بە ئەلف دەستپێ‌دەکات • لــە فەرهەنگۆکی ناوبراودا دەبینین ئەلفو لام خراونەتە سەر چەند وشەیەك : ( تفتیش ، مالیه ، موسم ، مختبر ••• هتد )و بەم جۆرە ئەم وشانە لەگەڵ ئــەو وشانە ڕیزکراون ، کە پیتی یەکەمیان بە ئەلف دەستپێ‌دەکات • ئەگەر وەها بێت ، ئەوە دەتوانرێ ئەلفو لام بخرێتە سەر زوربەی وشەکانو ئەوسا دەبێ بووترێ زوربەی وشەکانی عەرەبی سەرەتایان بە پیتی ئەلف دەستپێ‌دەکات • ئەم کەموکوڕییە نە ئەبوایە ببوایە ، بەتایبەتی چونکە شتێکی زۆر سادەو ساکارەو شارەزایی زۆری پێویست نییە •

هەر ئەم ناڕێکی‌یە ــ واتە ناڕێکیی ڕیزکردنی وشەکان بووە بە هۆی ئەوەی هەندێك وشە بپەڕێن ، یاخود خراپتر ــ هەندێك وشــە دوو جار بنووسرێن • لە لاپەڕە ( ١٩ )دا وشەی ( ضریبة ) نووسراوە ، کەچی لە لاپەڕە ( ٢٠ )دا ــ واتە پاش ئەوەی ٩ وشەی‌تر ڕیزکراون ــ ئنجا سەرلەنوێ وشەی ( ضریبة ) دراوە ، لەگەڵ ئەوەی هەردوو جارەکە بۆ یەك ماناو بۆ یەك مەبەست ئەم وشەیە تۆمارکراوە • وشەی ( فصل ــ السنه ، للکتاب ) لە لاپەڕە ( ٩ )دا نووسراوە ، کەچی لە لاپەڕە ( ٢٢ )دا

هەر بەو شێوەیە دووبارە کراوەتەوە . ( تعاون ) لە لاپەڕە ( ٨ )یش‌و ( ١٣ )یشدا تۆمارکراوە . ( موضوع ) لە لاپەڕە ( ٢٦ )یش‌و ( ٣٢ )شدا نووسراوە ... هتد .

× × ×

ئەوەی پەیوەندی بە وەرگێڕان‌و داڕشتن‌و داتاشینی زاراوەو وشەکانەوە هەبێت ، بێ سێ‌ودوو دەتوانین بڵێین ، لیژنە لەم بەشەدا سەرکەوتووە . بەرامبەر بە زوربەی وشە عەرەبییەکان وشەی کوردی وەهایان داناوە کە پڕ بە پێستی خۆیەتی‌و لەسەر زمان سووک‌و سادەو ڕەوانن . بەڵگەش بۆ ئەمە ئەمو چەند نموونەیەی خوارەوەیە :

لائق ـ لێ‌هاتوو ، لێ‌وەشاوە

لجنة التقدیر ـ لیژنەی نرخ‌بڕین

لجنة الانضباط ـ لیژنەی داپێن‌کردن

... هتد .

هەروەها بۆ گەلێك وشەی عەرەبی لە بەرامبەریان چەند وشەیەکی کوردییان نووسیوە ، کە ئەمەش نیشانی دەولەمەندیی زمانەکەمان ئەداو نیشانی ئەوەش ئەدا کە دانەرانی فەرهەنگۆکەکە شارەزاییەکی باشیان لە زمانی کوردیدا هەیە . چەند نموونەیەك لەو وشانە دەخەینە پێش چاو :

بسیط ـ سادە ، ساکار .

تقدیر ـ پەسەندکردن ، ڕێزلێ‌نان ، نرخ‌بۆدانان ، خەمڵ .

طائر ، طیر ـ مەل ، باڵندە ، پەلەوەر .

عیب ـ شوورەیی ، نەنگ ، خەوش .

طرز ـ شێوە ، جۆر ، ڕەنگ .

... هتد .

لەوەدا کەم‌وکورتییەك دەبینرێ ، کە بۆ هەندێ وشەی عەرەبی لە بەرامبەری یەكدوو وشەی کوردییان داناوە ، لەگەڵ ئەوەی لە زمانی کوردیدا وشەی تریش هەن کە مانای تەواوی ئەو وشە عەرەبییە دەدەن ، کەچی لە فەرهەنگۆکەکەدا نییە ، وەك : بەرامبەر وشەی ( الم ) نووسراوە ( ئێش ) ، بەڵام ( ئازار ) نەنووسراوە ، بەرامبەر بە ( ترابط ) نووسراوە ( پەیوەستی ) ، کەچی ( پەیوەندی ) نییە ، بەرامبەر بە ( فائدة ) نووسراوە ( سوود ) ، بەڵام وشەی ( کەڵك ) نییە ... هتد .

یەکێك لە کەم‌وکورییەکانی ئەم فەرهەنگۆکە ئەوەیە ، کە لیژنەکە زۆر خۆی بە زمانی عەرەبییەوە بەستووە . لە گەلێ شوێندا بە ئاسانی هەست بەوە دەکرێ زاراوەیان دانەڕشتووەو دانەناوە ، بەڵکو لە عەرەبییەوە وەریان گێڕاوە . ڕاستە فەرهەنگۆکەکە عەرەبی ــ کوردییە ، بەڵام دەبێ بە دوای ئەو زاراوە کوردییانەدا بگەڕێن‌و بیاندۆزنەوە کە بە تەواوی ماناو مەبەستی زاراوە عەرەبییەکان دەگرنەوە . خۆ ئەگەر لە زمانی کوردیدا وشەیەك بۆ بەرامبەر وشەیەکی عەرەبی نەبێ ، ئەوە ڕێگا بۆ داڕشتن‌و داتاشین‌و دروستکردنی وشە زۆرە . ئەگەر هەر پێویستیش بە وەرگێڕان کرا ، ئەوە مەرج نییە خۆمان بە زمانی عەرەبییەوە ببەستین ، بەڵکو پێویستە ئاوڕێك لە زمانە ئەوروپاییەکان بدەینەوە . ئەم خۆبەستنە بە زمانی عەرەبییەوە بووە بە هۆی دروستکردنی چەند زاراوەیەك ، کە نەك تەنها ناڕێکین‌و لەسەر زمان گرانن ، بەڵکو گیاێتیکی کوردیشیان نەکراوە بە بەردا . لەبەر ئەوە ، ئەو جۆرە وشانە تەمەنیان درێژ نابێت . وەك :

استمارة النقل ــ گواستنەوەنامە

استمارة القبول ــ وەرگرتننامە

مدقق ــ وردیار

... هتد .

هەندێ وشەی کوردی لەگەڵ مانای وشە عەرەبیەکاندا بە تەواوی ناگونجێن ، یاخود جیاوازیەك لە نێوانیـاندا هەیە . وەك دەبینین بۆ وشەی ( اعتذار ) بەرامبەری نووسیویانە ( بیانوو هێنانەوە ) ــ هیــچ مەرج نیە گەر یەکێك داوای ( اعتذار ) لە یەکێك بکات ، ئەوە ئەبێ بیانووی بۆ بهێنێتەوە . بەرامبەر بە ( خطبة ) نووسراوە ( دووان ) ــ گەر چەند کەسێك پێکەوە (بدوێن) ، ئەوە وا ناگەیەنێ ، کە ( خطبة )یان بۆ یەکتر داوە . بەامبەر ( تاکید ) نووسراوە ( دووپاتکردنەوە ) ــ دەتوانرێ شتێك سەد جــار بووترێ ، بەڵام ( تاکید )ی لەســـەر نەکرێ ... هتد .

جگە لەوە لە دانانو دارشتنو دۆزینەوەی وشــەو زاراوەکاندا ئاگاداریی شێوەکانی کوردیان نەکردووەو ئەمەش بووە بە هــۆی ئەوەی ، ئەو وشەو زاراوانە لــە چوارچێوەیەکی تەسكدابن . لــەو باوەڕەداین ، کە ئاوڕدانەوەیەك لە شێوەکانی تری زمانی کوردی تەنها دەبوو بە هۆی سەرخستنی فەرهەنگۆکەکە ،دەبوو بە هۆی فراوانکردنی سنووری بەکارهێنانی ، دەبوو بە هۆی کەمکردنەوەی کەموکوڕی ... لە هەموو فەرهەنگۆکەکەدا لە دووسێ وشە پتر نیە ، کە لــە سنووی سلێمانی دەرچووبێو ئەمەش بووەتە هۆی بوونی هەندێك ناتەواوی .

بۆ کۆکردنەوەی ئەو وشە کوردیانەی کە بەتەواوی ماناو مەبەستی وشــــە عەرەبییەکان بگرنەوە ، دەبوایە لە پێشـــــا هەموو ئەو وشە عەرەبییانەی کە ویستوویانە ماناکانیان بە کوردی بدەن « بە ناو خەڵکا بڵاوبکەنەوە ، بە هۆی ڕۆژنامەو گۆڤارو نامیلکەو تەنانەت ڕادیۆشەوە ، بێ ئەوەی ماناکانیان بە کوردی بۆ لێك بدەنەوە . بەڵکو داوا لە خەڵکی بکەن چیان بە بیرا دێ بیخەنە سەر قاقەز بۆ کۆڕی بنێرن ... شــان بەشانی ئەوەش ئەبێ کۆڕەکە چەند لیژنەیەك دروست بکاو هەر یەکە

دەسەڵاتێکی تایبەتی بۆ دەست نیشان بکا . وە یەك یەك بیاننێرن بە ناو خەڵکا بگەڕێن ، بە نـاو لادێکانا بۆ پرسکردنو ڕاوەرگرتنو کۆکردنەوەی وشە ... »[11] . بێگومان ئەو ئامۆژگاری‌یەی کە مامۆستا نەبەز ماوەی دە ساڵێك لەمەوبەر کردوویەتی دەبوایە لیژنەکەڵکی لێوەرگرتایە . ئێمەش لەو باوەڕەداین . گەر بەم شێوەیەی مامۆستا جەمال نەبەز وتوویەتی بکرایە ، ئەوا فەرهەنگەکە گەلێك سەرکەوتووتر دەبووو لە زوربەی ئەم کەموکورییانە دووردەکەوتەوە .

ئەو کەموکـورییانەی باسمانکردن کـەم بن یا زۆر لـە نرخی فەرهەنگۆکەکە کـەم ناکەنەوە ، چونکە ئاشکرایە کـە دانەرانی فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سـلێمانی » کارێکی گەورەو گرانیان پێسپێررابوو . جێبەجێکردنی ئەم کارەش ئاسان نەبوو .

لەو باوەڕەداین گەلێك تەگەرەو کۆسپ هاتۆتە ڕێگایان ، کە چارەسەرکردنیان ئاسان نەبووە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هونەری بەرزی خۆیان نیشانداوەو لە نووسینی فەرهەنگۆکەکەدا سەرکەوتوو بوون . ئەو کەموکورییانەش کـە هەن دەتوانرێ لـە چـاپی دووەمدا دووربخرێنەوە .

ئومێـدەکەین ، کـە مامۆستایانی بەڕێز ، دانەرانی ئـەم فەرهەنگۆکە ، ئەو زانایانە ، کوردپەروەرانەی ئەم هەنگاوە گەورەیەیان ناوە گەلێك هەنگاوی‌تر بهاوێژن لە ڕێگای پێشخستنی زمانەکەماندا . داواشمان ئەوەیە کە بە دڵێکی فراوان ئەم بیروڕایەی ئێمە وەربگرن(*) .

---

(11) جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ( ریاضـیات ) لەژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، سـالی ١٩٦٠ ، ژ ٦ ، ل ١٠٤ – ١٠٥ .

**(*) ئەم نووسـینە لە ژمارە ( ١٦١و ١٦٢ )ی ڕۆژی ٦ و ١٣ی نیسانی ١٩٧٣ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا بلاوکراوەتەوە .**

# نامەیەك بۆ مامۆستا ئالانی

لە ژمارە ( ١٦١و ١٦٢ )ی ڕۆژی ٦و ١٣ی نیسانی ١٩٧٣ی ڕۆژنامەی ڕازاوەی « هاوکاری »دا وتارێکم لەبارەی فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »یەوە بلاوکردبووەوە ٠ یەکێك لە دانەرانی فەرهەنگۆکەکە ، کە مامۆستا ئالانی یە لە ژمارە ( ١٦٨و ١٦٩ )ی هەمان ڕۆژنامەدا لەژێر ناوی « وەلامی چەند سەرنجێکی دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف »دا بیروڕای خۆی بەرامبەر بە وتارەکەی من نیشانداوە ٠ بە وتارەکەی مامۆستا ڕەئووفدا وا دەردەکەوێ کە خۆی ئەندامێکی چالاکو بە پەرۆشی لیژنەی ناوبراو بووەو بۆ بەجێهێنانی ئەو کارە پیرۆزە هەولو تەقەلایەکی زۆری داوەو ئەمەش بێگومان لە کاك ڕەئووف دەوەشێتەوە ٠ شایانی باسە ، هێشتا کە لە دەرەوەی ولات بووم ، جاروبار وتارەکانی مامۆستا ئالانیم دەخوێندەوەو هەستم دەکرد بەرهەمی قەلەمی مرۆڤێکی دلسۆزو بەهرەدارن ٠ ئەمەش لە دلما ڕێزو تەقدیری بەرامبەر بە مامۆستا پەیداکردو بۆیە دوای گەڕانەوەم بەدل حەزم دەکرد بە دیدەنی شادبم ٠ خوای منو تۆ کردیو چەند ڕۆژێك بەر لە دەرچوونی وتارەکەی خۆیم دیو ئەوەندەیتر چوو بە دلماو هیوامە لە وێنەی لە ڕیزی ڕۆشنبیرانی کورددا تا دێ زۆربێو وا لێرەدا بە ئەوپەڕی خۆشەویستیو قەدرەوە وەلامی وەلامەکەی دەخەمە بەرچاوی خۆیو خوێنەری بەرێز ٠

بێ گومان ، هەر نووسینێك ( لێکۆلینـــەوە ، ڕوونکردنەوە ، ڕەخنە ... ) خزمەتی تێدا بێت پێویستە بە چاوی ڕێزو دلی فراوانەوە وەری بگرین و منیش هەر لەم قوژبنەوە سەیری وتارەکەی مامۆســـتا ئالانی دەکەم ، بۆیەکا هێرشە نەرمو نیانەکانی ( ! ) کەمو زۆر دلگیریان نەکردم • چونکە دەزانم لە دەروونێکی پاکەوە هەلقولاون و بەکێـلك وتوونی کە لەگەل ئەو کارەدا زەحمەتی کێشاوەو هیلاك بووەو ئەوەی کە وتووشیەتی لە ڕێگای خزمەتەوەیە • منیش مەبەستم تەنها خزمەتەو هیچی تر ، بۆیەکا بە پێویستی دەزانم بە کورتی کەمێك لە وەلامەکەی مامۆستا ڕەئووف بدوێم ، چونکە هەر لەم ڕێگەیەوەیە ، کە دەتوانین گەلێك کاری ئالۆز خاوبکەینەوەو بگەینە ئەنجامی ڕاستو بەکەلك •

لە وتارەکەمدا لەوە دوابووم کە لیژنەکە هەندێ وشەی پێویستیان فەرامۆش کردبووو هەندێ وشەش کەبۆ ئەو مەبەستە زۆر پێویست نین کـــەچی کەوتوونەتە نـــاو فەرهەنگۆکەکەوە • مامۆســـتا ئالانی دەستەواژەی ( ئەو مەبەستەی ) پەڕاندووە یاخـــود بەدی نەکردووەو ئەمەش بووەتە هۆی شێواندنو وەرچەرخاندنی ڕاکەی من • مامۆستا ئالانی دەلێ : دوکتۆر دەلێ : « هەندێ وشەی پێویستیان فەرامۆش کردووە ، هەندێ تری ناپێویستیان هێناوەتە فەرهەنگۆکەکەوە ... » • بەو شێوەیەی مامۆستا ئالانی داویەتە قەلەم من وام نەنووسیوەو تـــا ڕادەیەکیش ئەمە شێواندنی باوەڕە لە زانستدا • جگە لەوە دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە هەر کارێکی زانستی بەر لە هەموو شتێك پێویستە بە ئەرکی سەرەکیی خۆی هەلستێت و ئنجا لە پاشا پەل بهاوێژێ ... بەتایبەتی فەرهەنگۆکی ناوبراو کە مامۆستا ڕەئووف خـــۆی دەلێ : « نامیلکەی ناوبراو لە فەرهەنگۆکیش بچووکترە ... » • جا گەر ئەو نووسراوە هێندە بچووکە بۆچ دەبێ ئەرکی سەرەکیی خۆی فەرامۆش

دەکات و کاری گرنگی خۆی بەجێنەهێنێ و پەل بۆ گـــەلێ لای تر بهاوێژێ •

مامۆستا رەئووف ڕاست دەفەرمووێ کە دەڵێ بۆ ڕوونکردنەوەی زاراوە گەڕان بەناو دێهات و ئێلاتی کوردەواریدا شتێکی ئاسان نیە • بەڵام با مامۆستا ئەوەش لەبیر نەکات کە زاراوێکی نالەبارو چەوت و ناڕاست کەوتە ســـەر زارو زمان و ڕەگی داکـــوتا لابردنی ئەویش ئاسان نیە •

لە وتارەکەمدا لەوە دواوم کــە چۆن لــە ڕیزکردنی وشـــەکانی فەرهەنگۆکەکەدا پاش و پێشێکی ئێجگار زۆر هەیە و بە چەند بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕەوان ئەو ڕاستیەم سەلماندووە • هەروەها نیشانم داوە ، کە باشتر بوو وشەکانی فەرهەنگۆکەکە بە گوێرەی ئەو زنجیرەیەی لـــە ئەلفوبێی عەرەبیدا هەیە ڕیزبکرێن • لەم بارەیەوە مامۆســـتا ئالانی نووسیوێتی : « ئێمەش وامان کردووە » • بۆ خستنەڕووی ڕاستی بە مامۆستا دەڵێم ، بەداخەوە واتان نەکردووە ، چونکە گەر واتان بکردایە هەڵبەت نەدەهاتن پاش وشەی ( اساس ) چل و دوو وشـــە ڕیزبکەن و ئنجا ( اساسی ) تۆماربکەن • وشەی ( اختصاصی )یان نەك هەر لـــە پاش ( اختصاص )ەوە نەنووسیوە ، بەڵکو شەست و سێ وشەیان لـــە نێواندا تۆمارکردووە • ( ترفیع ــ راتب ) ، ( ترفیع ــ فی المنصب ) ، ( ترفیع ــ فی الدرجه ) نەك هەر لە یەکەوە دوور دایان ناون ، بەڵکو هەر یەکەیان خزاوەتە سووچێك و لاپەڕەیەك • وشەی ( ابلة ) نەك تەنها لە دوای وشەی ( ابداع )ەوە نەیان نووسیوە ، بەڵکو چـــوار لاپەڕە لەیەك دوورن ... ئەی هـــۆی چیە کـــە ئەلف و لام خراوەتە سەر ( تفتیش ، مالیة ، مختبر ، موسم ... )و لە ڕیزی ئەو وشانە دانراون کە سەرەتایان بە ئەلف دەستپێدەکات •

وابزانم ئەو نموونانە بەئاشکرا ئەوە نیشان دەدەن ، کە دانەرانی فەرهەنگۆکەکە بە تەواوی پەیڕەوی ڕێبازی زانستی ڕیزکردنی وشەیان نەکردووە . شایانی باسە ، مامۆستا ڕەئووف خۆشی لەژێر لێــوەوە ددانی بەم ڕاستییەدا ناوە کە دەفەرموێ : « ئەمەیان تا ڕادەیەك بەجێ بەو پەیوەندی بە هونەری ڕیزکردنەوە هەیە »[1] .

بەداخەوە لە وتارەکەی مامۆستا ئالانیی بەڕێزدا هەندێ شێواندنو وەرچەرخاندنو لەمەبەست تێنەگەیشتن بەرچاو دەکەوێ . بۆ نموونە من لــە وتارەکەمدا لــە چەند ڕێگایەکی زانستی لەبارەی کۆکردنەوە ( نەك ڕیزکردن )ی[2] وشەوە بۆ فەرهەنگ بەگشتی دواوم ، کــەچی مامۆستا بە شێوەیەکیتر وشــــەکانی منی گێڕاوەتەوەو دەفەرموێ : « کە دەڵێت بەپێی ئەلفوبێ ڕیزبکرێن ئێمەش وامان کردووە ، کەچی ئەو مەبەستە هەڵدەوەشێنێتەوە کە پێمان دەڵێ : ئەو وشە عەرەبییانەی لەیەك چاوگن دەبێ لێــــك نەپچڕێن ، وەك : ( محافظ ، محافظه ، احتفاظ ، حفظ ... هتد ) . باشە ئەوا ( محافظ ) لە بەشی میمــدا تۆمارکرا ، ئەی ( حفــظ ) کــە لــە بەشی جێیە چۆن لەگــەڵیا ڕیزدەکرێت ؟ » .

وەك لــە ســەرەوە ڕوونمکردەوە دانەرانی فەرهەنگــۆکەکە وشەکانیان بە تەواوی بەپێی زنجــیرەی ئەلفوبێ ڕیزنەکردووەو لــەو ڕووەوە مەبەستی خۆمم هەڵنەوەشاندۆتەوە ، بەڵام دیارە بە هۆی ئەو شێواندنو وەرچەرخاندنو لە مەبەست نەگەیشتنەی مامۆستاوە ڕاکەی من بەو مەرەیە براوە . ئەگینا لە بەشی دووەمی ئەو چەند دێڕەی مندا کــە مامۆستا هێناونیەوە ، مەبەست کۆکردنەوەی وشــەیە ، نەك

---

(١) ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، ژ ١٦٨ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٦ .

(٢) کە دوو شتی جیاوازن لە زانستی فەرهەنگنووسیدا .

ڕیزکردن ... لێرەدا نامەوێ سەرلەنوێ لەم باسە بدوێم ، بەڵکو جارێکی‌تر بە وردی چاوخشاندن بە وتارەکەمدا ڕاستی دەخاتە ڕوو .

بەداخەوە لە وتارەکەی مامۆستا ئالانی‌دا تەنها دەستکاری هەندێ لە قسەکانم نەکراوە ، بەڵکو لە هەندێ شوێندا شتی تریشیان خراوەتە سەر . بەوێنە من وشەی ( محافظ ومحافظه )م بە نموونە هێنابووەوە ، کەچی مامۆستا ( احتفاظ وحفظ )یشی بە شێوەیەك خستوتە سەر کە گوایا ئەو دوو وشەیەش من هێناومنەتەوە . وا بزانم مامۆستا لەگەڵمدایە ، کە ئەمە لەگەڵ ئەمانەتی عیلمیدا ناگونجێ .

جگە لەوە وا بزانم هیچ هۆیەك لە ئارادا نیە بۆ دلگیربوونی مامۆستا ڕەئووف لەوەی بە دلسۆزی‌و مەبەستی کەلکی گشتیی چەند ڕەخنەیەکم لە جۆری ڕیزکردنی وشەکانی فەرهەنگۆکەکەیان گرتووە بێ ئەوەی خوانەکردە ڕێگە بە خۆم بدەم « بە ناوی زانستەوە » وەك دەفەرموێ ، دەرسی کەس دابدەم . منیش‌و مامۆستا ئالانیش‌و هەر کەسێکی‌تریش پێویستمان بە هاوکاری‌و یارمەتی‌و ڕێگەنیشاندان هەیەو زۆر جاری واش هەڵدەکەوێت شاگرد ڕەخنەی ڕاست‌و ڕەوان لە مامۆستای خۆی بگرێ‌و هیچ دوور ناڕۆم ئەگەر بڵێم کۆمەڵە دواکەوتووەکەی ئێمە لە هەموو لایەك زیاتر پێویستی بە ڕەخنەی زانستی هەیەو بێ‌گومان دیاری‌کردنی کەم‌وکوڕتییش ئەنگی نیە بۆ ڕەخنەلێ‌گیراو . تاقە مەبەستی ڕەخنەکانی منیش خزمەتی زمانەکەمانەو هەر لەبەر ئەوەشە کە بە ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستی‌یەوە باسی دانەرە بەڕێزەکانی فەرهەنگۆکەکەم کردووەو وا لێرەدا هەر بۆ نموونە ئەو چەند دێڕە دەخەمە بەرچاو کە کۆتایی وتارەکەمم پێ‌هێناوەو دەڵێم :

« لەو باوەڕەدایین گەلێك تەگەرەو کۆسپ هاتۆتە ڕێگایان کە چارەسەرکردنیان ئاسان نەبووە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هونەری

بەرزی خۆیان نیشانداوەو لە نووسینی فەرهەنگۆکەکەدا سەرکەوتوو بوون . ئەم کەموکوڕییانەش کە هەن دەتوانرێ لــە چاپی دووەمدا دووربخرێنەوە . ئومید دەکەین کە مامۆستایانی بەڕێز ، دانەرانی ئەم فەرهەنگۆکە ، ئەو زانایانە ، کــوردپەروەرانەی کــە ئەم هەنگاوە گەورەیەیان ناوە ، گەلێك هەنگاویتر بهاوێژن لە ڕێگای پێشخستنی زمانەکەماندا . داواشمان ئەوەیە کە بە دڵێکی فراوان ئەم بیروڕایەی ئێمە وەربگرن »[٣] .

وا بزانم ئەو قسانەی من بێ پێچو پەنا وەها دەگەیەنن کــە من بەشانازییەوە ددان بەوەدا دەنێم کە وا زانــاو کوردیزانو مرۆڤی بە توانامان هەیەو بەچاوێ قەدرو ڕێزو خۆشەویستییەوە سەیریان دەکەمو گەلێکیان بە مامۆســتای خۆم لــە قەڵەم دەدەمو هەر لەبەر ئەوەش نەدەبوو مامۆستا ئالانی دڵ لە دڵ بداو بە تەوســـێکەوە بنووسێ : « ئێمەش لــەم هونەرەدا برێ چەشەمان کردووە ... » . نەخێــر مامۆستای بەڕێز ئێوە گەلێك لە برێ زیاتر چەشەتان کردووەو ئەوەش جێگای ڕێزو تەقدیرە لای گشت لایەك .

مامۆستا ئالانی لە وتارەکەیدا دەفەرموێ : « گرنگی داڕشتنی وشەکانە ، نەك ڕیزکردنیان ... » . ئەمە زۆر ڕاستەو ئەگەر مامۆستا جارێکیتر سەرنج لە وتارەکەی من بداتەوە دەبینێ منیش بەم جۆرە ئــەو ڕاستییەم تۆمارکردووەو نووسیومە : « ئەوەی پەیوەندی بــە وەرگێڕانو داڕشتنو داتاشینی زاراوەو وشـــەکانەوە هەیێت ، بێ سێودوو دەتوانین بڵێین کە لیژنەکە لەم بەشەدا سەرکەوتووە » . لێرەدا ڕای هەردووکمان یەکدەگرنەوەو هەروەها باوەڕمان یەکە کــە ئەم فەرهەنگۆکە کارێکی بەنرخو سەرکەوتووە . جا بۆیەکا دەرخستنی

---

(٣) ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، ژ ١٦٢ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٧ .

چەند ناتەواوییەك نرخو پایەی کەمناکەنەوەو نابێتو ناشێت ببێتە هۆی دڵگیربوون ، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەش بزانین کە وا نەك لە وڵاتی ئێمە ، بەڵکو لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانیشدا یەکجار بەدەگمەن کاری بێهەڵەی لەو بابەتە دەکەوێتە بەرچاوو لەگەڵ ئەوەشدا ج لەوێو لێرە رەخنەی زانستی مایەی پێشخستنو گەشەپێکردنە . لینین لەم بارەیەوە نووسیوێتی : « هەر زانستێك لەسەر بناغەی زانینی مەردومو بنچینەی رەخنەو روونکردنەوەو تێگەیشتنی هەموو ئەوەی لە زوودا کراون دابڕێژرێ پێشدەکەوێو گەشەدەکا »[٤] .

ئەوەی بەلامەوە جێگای سەرسوڕمان بێ ، ئەوەیە کە مامۆستا دەڵێ : دوکتۆر « ددانی نا بەوەدا کە زاراوەکان لە داڕشتنو واتادا سەرکەوتوون ، بەڵام لە هەمان کاتدا پەشیمان بۆوە بە چەند بەڵگەیەك کە وەڵامم دانەوە » . بۆ روونکردنەوەی تەواو دەبێ سەرلەنوێ بڵێم : بەڵێ مامۆستایان کارەکەتان سەرکەوتووە ، بەڵام کاری سەرکەوتوو مەرج نییە بێ کەموکورتی بێت . کەموکورتییش نابێت بە هۆی کەمکردنەوەی نرخی ئەو فەرهەنگۆکەو نووسەرانی بەڕێزی . کەم رێدەکەوێت شتێك لە زانستدا ، لە سروشتدا ... کەموکورتی تێدا نەبێ . خۆ بە نیسبەت لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە نەبوونی کەموکورتی جێگای سەرسوڕمانە ، نەك بوونی .

جا گەر پاش باسکردنی رووە باشەکانی کارەکەتان لە کەموکورتییەکانیش دوابم ، ئەمە نیشانەی پەشیمانی نییە ، بەڵکو نیشانەی ئەوەیە کە تەنها یەك چمکی لێکۆڵینەوەکەم نەگرتووە ، بەڵکو لەگشت سەرێکەوە بایەخم پێداوەو ئەمەش راسترینو مەوزوعیترین

---

(٤) ف . ئی . لینین ، « مارکس ، ئینگلس ، مارکسیزم » ، ١٩٤٧ ، ل ٤٥٧ (بە زمانی رووسی) .

ڕێگای لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنەو قەت نایێت بەو نووسینانە قایل بین کە مەبەستیان تەنها دەرخستنی ڕووی باش یان خراپی بەرهەمی زانستییەو هەر لەبەر ئەوەشە کە من تەنها چمکێکی باسەکەم نەگرتووە • بەم بۆنەیەشەوە گلەییەکی بچووك لە ماموستای بەڕێز دەکەم کە لە وتارەکەیدا گەلێك لەو ڕایانەی کە من دەربارەی فەرهەنگۆکەکەیان داومن و ئەو بە ڕاستیان دەزانێ فەرامۆشی کردوون و بەسەریانا تێپەڕیوە •

لە وتارەکەمدا سەبارەت بە ڕووی باشی فەرهەنگۆکەکە لەوە دوابووم کە بۆ هەندێ وشەی عەرەبی لە بەرامبەریان چەند وشەیەکی کوردیان نووسیوە ، کە ئەمەش دەوڵەمەندیی زمانەکەمان و شارەزایی دانەرانی فەرهەنگۆکەکە نیشاندەدات • بۆ سەلماندنی ئەم باوەڕە چەند نموونەیەکم هێنابووەوە ، وەك :

بسيط ــ سادە ، ساکار

طير ــ مەل ، باڵندە ، پەلەوەر

••• هتد •

لە وەڵامی ئەم ڕایەی مندا ماموستا ئالانی نووسیوێتی : « من بە ڕای خۆم ( هەرچەند ئەندامێکی لیژنەکەم ) ئەم کارە بە عەیب دادەنێم لە زمانی نووسیندا » • هەروەها پاش چەند دێڕێك دەڵێ : لەم چەرخە نیژڕەوەدا کەی باوی ئەوە ماوە بۆ شتێك هەگبەیەك وشە بخەیتە کار •••

بە نیسبەت گەلێك زاراوەوە ڕاکەی ماموستا ڕاستە ، بەڵام بۆ ئەو وشانەی کە لە سەرەوە ناوم بردوون ڕاست نییە • ئەو جۆرە وشانە کە (Synonym) یان پێدەڵێن لە بەشی زانستی وشە (Lexicology) دا شوێنێکی تایبەتییان وەرگرتووەو لە هەموو زمانی نووسینی سەرزەمیندا هەن و جێگای شانازیی و مایەی دەوڵەمەندیی زمانن • لەبەر

ئەوە مامۆستا لەو ڕەخنەیەدا بەهەڵە چووەو زانستی زمان ڕەفزی دەکا ، چونکە ئەو بیرەی ئەو دەیێتە هۆی هەژارکردنی زمان لە کاتێکدا ئەمڕۆ لە هەموو جیهاندا ڕۆژی دەولەمەندکردنێتیو بە دەها دەزگای زانستی ولاتە پێشـــکەوتووەکان هەموو کاتو توانایان بۆ ئـــەم مەبەســـتە تەرخانکردووە .

مامۆستا لە کۆتایی وتارەکەیدا لە باس لایداوەو کەوتۆتە بیانووو ڕەخنەی لەوە گرتووە ، کە وتارەکەی من بەناوی ( د. ئەوڕەحمـــان حاجی مارف )ەوە بلاوکراوەتەوە . بەلام بە مامۆستا دەلێم ئەمە باسێکی کەیەو باوەڕیشی بێت ، کـــە بۆ ڕۆژنامەی ڕازاوەی « هاوکاری »یم نووسیبوو ( د. ئەوڕەحمەنی حاجی مارف ) . بەلام بلێم چی کە لـــە چاپدا بووە بە ( دوکتۆر ئەوڕەحمان حاجی مارف ) . خۆ ئەگەر منیش بەدوای شـــتی وادا بگەڕێم ژمارەیەکی کـــەم هەلە لـــە وتارەکەیدا نادۆزمەوەو لەوە دلنیام زوربەیان هەلەی چاپن . جا دەبوو مامۆستا ڕەئووفیش لەوە دلنیا بێت ، منیش ئەوەندە دەزانم کە ( دوکتـــۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف )م . بەلگەشم هەر وتەکانی خۆێن کە دەلێ : « بەلام بێبەلاین هەر کە دەستمان دایە پێنووســـەکەمان بەبێ ئەوەی باری کۆمەلەکەمان هەلســـەنگێنین .. دەنووســـین ، وابوو وایەو وا بکرێ » . جا کاکی خۆشەویســـت باش دەبوو کە باری چاپەمەنیی کوردیش هەلسەنگێنێو بزانی چەند تەنگو چەلمە هەیە لە ڕێگایدا . بۆ نموونە وتارێکم دەربارەی قەناتی کـــوردۆ بۆ ڕۆژنامەی نازداری « برایەتی » ناردبووو بێگومان نووسیبووم ( دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ) . ئەو وتارەمیان بە سێ جار بلاوکردەوەو هەر جارەی بە شێوەیەك ناوی خۆمو باوکمیـــــان چاپ کردبوو : ( ١ــ دوکتۆر ئەوڕەحمان حاجی مارف ، ٢ــ د. عەبدوڕەحمان مارف ، ٣ــ دوکتۆر ئەوڕەحمان مەلا مارف ) . ئەمەش نە خەتای منی تێـــدایەو نە شتێکە

پەیوەندی[5] بە باسەکەوە نییەو ئەو خزمەتەی چاپەمەنیو ڕۆژنامە کوردییەکانمان دەیکەن شایانی ڕێزو تەقدیرە . هەروەها شکم نیە کە ڕێکەوتی وەهاش لە چاپکردنی وتارەکانی مامۆستادا ڕوویداوەو ئەمەش شتێکی وەها نیە کە بەو شێوە توندە ڕەخنەی لەسەر بگیرێ .

دوا وشەم ڕێزو تەقدیرە بۆ گشت ئەندامانی لیژنەی نووسینی فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی »و سوپاسە بۆ مامۆستای خۆشەویست کاك ڕەئووفی ئالانیی بەڕێز ، کە هیوامە لەوە دڵنیا بێت کە وا زۆر دڵسۆزانە « دەستان داوەتە پێنووسەکەمان »و بەپێی توانامان بە وردی « باری کۆمەڵەکەمان هەڵدەسەنگێنین »و قەت لە خۆمانەوە نانووسین « وابووو وابەو وا بکرێ »و هەر ئەوەشە وا لە منو لە هەموو ڕۆشنبیرێکی دڵسۆزی کورد دەکا بە ئەوپەڕی خۆشەویستیو قەدرو ڕێزو شانازییەوە سەیری کۆششی دڵسۆزانەی پیاوی لێهاتووی وەك ئەندامانی دانانی فەرهەنگۆکی « زاراوەی پارێزگای سلێمانی » بکەینو زیاتر لەدوارۆژی گەلی کوردی سەربەرزمان دڵنیابین ... هیوامە ئەم چەند وشەیەم بە چەپکە گوڵی وەفاو خۆشەویستی لەقەڵەم بدەنو لە هەموو هەڵەیەکم ببورن ، کەدیارە خۆم هەستم پێیان نەکردووە . ئەگینا هەرگیزاو هەرگیز مافی ژیانم نەدەدانێ(*) .

(5) بڕوانە : ڕۆژنامەی « برایەتی » . ژ ٤٦و ٤٧و ٤٨ی ساڵی ١٩٧٢

**(*) ئەم وتارە لە ژمارە ( ١٧٤و ١٧٥ )ی ساڵی ١٩٧٢ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا بڵاوکراوەتەوە .**

# بنچینەی دانانی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی
# بۆ قوتابخــانە

## ـ پێشـــەکی ـ

## مێژووی ڕێکخستنی فەرهەنگە کوردییەکان

### ١ ـ لە سەرەتاوە تا شەڕی یەکەمی جیهان :

دەمێکە دەست بە کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردی کراوەو دانەری یەکەم فەرهەنگی کوردی کورد بووە . لــە ساڵی ١٠٩٤ك ـ ١٦٨٢/ ١٦٨٣زدا شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانی لەژێر ناوی «نەوبەهار»دا فەرهەنگۆکێکی بۆ یارمەتی‌دانی منداڵانی کورد لە فێربوونی زمانی عەرەبیدا نووسیوە . دەستنووسی ئەم فەرهەنگۆکە دوو جار لە چاپ دراوە : یەك ـ لە پاشـــکۆی فەرهەنگەکـەی یوسف ضـیا پاشای خالدی[1] و دوو ـ لە کتێبەکەی ( لێ‌کۆك )ی زانای ئەڵمانیدا[2] .

یەکەم فەرهەنگی کوردی کە لە لایەن ئەوروپاییەکانەوە نووسرابێ

---

(١) خالدی یوسف ضیاءالدین باشا « الهدیة المحمدیة في اللغــة الكردیة » ، استانبول ١٨٩٣ .

(2) Le Coq, Kurdische Texte, Berling 1903.

ئەو فەرهەنگە ئیتالی کوردییەیە کە قەشەی ئیتالی ( ماوریزۆ گارزۆنی Maurizo Garzoni ) لە سالی ١٧٨٧دا لە ڕۆما لە پاشکۆی ئەو کتێبەیدا کە لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسیویتی‌و بلاوی کردۆتەوە[٣] . ئـەم فەرهەنگە دەوروبەری پێنج هەزار وشەی ئیتالیە کـە ماناکانیان بە شێوەی کوردی ئامێدی لێك‌دراونەتەوەو لە چۆنیەتی شەرح‌و کردنەوەو دانی مانای وشەدا بە نیـسبەت ئەو دەمەوە زۆر سەرکەوتووەو لەگـەل ئەوەشدا کە نزیکەی ( ٢٠٠ ) سالێك بەسەر لەچاپدانیدا تێپەڕیوە ، بەلام هێشتا سوودو کەلکی هەر بەردەوامە .

لـە سالی ١٢١٠ك ـ ١٧٩٥زدا شێخ مارفی نۆدێی لەژێر ناوی « أحمدی »دا بە شیعر فەرهەنگۆکێکی عەرەبی ـ کوردی داناوە . دەستنووسی ئەم فەرهەنگۆکە هەر لـە سالی ١٩٣٦دا دوو جار لـە چاپ‌دراوە : یەك ـ لە سلێمانی[٤] ، دوو ـ لە بەغدا[٥] .

لە پاش نووسینی ئەو چەند کارەی لە سەرەوە ناومان بردن تـا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لەم ڕووەوە هیچ شتێکی وەها نەنووسراوە کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە هەبێت تەنها ئەو دوو سەد وشەیەن کە لە لایەن ریچ[٦]و ئەو ٢٧٣ یەی لە « فەرهەنگی بەراوردیی هەموو زمان‌و شێوەکان »دا تۆمار کراون[٧] .

---

(3) Grammatica e vocabolario della lingua Kurda. - Compost dal. P. Maurizio Garzoni, Roma, MDCCL XXXVII.

(٤) شێخ مەعرووفی نۆدێی « احمدی » ، سلێمانی ١٩٣٦ .

(٥) شێخ مەعرووفی نۆدێی « احمدی » ، بەغداد ١٩٣٦ .

(6) Narrative of a Residence in Kurdistna by the hate. R. Gl. T. Rich. London, pp. 394-398.

(٧) فەرهەنگی بەراوردیی هەموو زمان‌و شێوەکان ، پیترسبورگ ، ١٧٨٧ ، ب ١ ، ل ٧٧ .

له سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی بەگشتی و نووسینی فەرهەنگ بەتایبەتی کەوتە برەو . لە ساڵانی ١٨٥٦و ١٨٥٧و ١٨٥٨دا ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ ، زانای گەورەی ڕووس ــ پیۆتر لێرخ لەبارەی کوردو کوردستانەوە سێ کتێبی بڵاوکردەوە[٨] ، کە تا ئەمڕۆش لە کتێبخانەی کوردناسیدا هاوتایان کەمەو بە سەرچاوەیەکی ڕەسەن دەژمێررێن . لە کتێبی سێیەمیدا فەرهەنگێکی کوردی ( کرمانجی ژوروو ) ــ ڕووسی ( ل ١ــ٨٤ ) . وە کوردی ( زازا ) ــ ڕووسی ( ل ٨٥ــ١٠٨ ) لە چاپدراوە .

ئـا . ژابا جگە لەو خزمەتە بێ شومارەی کە لە تۆمار کردنی فۆلکلۆرو لێکۆڵینەوەی کوردو زمانەکەیدا کردوویەتی ؛ لە نووسینی فەرهەنگی کوردیشدا شوێنێکی دیاری هەیە . ئەم زانایە خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردی ــ فەرەنسایی یە کە لە پاش خۆی بە فەرمانی ئەکادیمیەی زانستی ڕووس لە ساڵی ١٨٧٩دا لە چاپدرا[٩] . ئەم فەرهەنگە بریتی یە لە ( ٤٦٣ ) لاپەرەو ( ١٥ ) هەزار وشەی کوردی . ئـا . ژابا هەروەها دوو فەرهەنگی تریشی داناوە ، فەرەنسایی ــ ڕووسی ــ کوردی ، وە کوردی ــ فەرەنسایی ــ ڕووسی ؛ کە هێشتا بە دەستنووسی ماونەتەوەو لە ئارشیفی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت لە لێنینگراد هەڵگیراون .

س . ری ــ میسیونێر ( مبشر )ی ئەمەریکایی ماوەیەکی درێژ لە ناوچەی هەکاری ژیاوەو ساڵی ١٨٧٠ کتێبێکی بچووکی ڕێزمانی زمانی

---

(٨) پیۆتر لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێرانەوە ، پیترسبورگ ، ١٨٥٦ ، ١٨٥٧ ، ١٨٥٨ .

(9) A. Jaba, Dictionnaire Kurde - français, St - Petersbourg, 1879.

کوردی بڵاوکردۆتەوە[10] • لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا فەرهەنگۆکێکی بیست لاپەڕەیی کوردی ـ ئینگلیزی نووسیوە •

نزیك کۆتایی سەدەی نۆزدە ڕۆژهەڵاتناس ـ سۆتسین کتێبێکی نوێی لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[11] ، کە بەشی سێیەمی بریتی‌یە لە فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئەڵەمانی ( ل ٢٨١ ـ ٣٤١ ) •

لە کتێبەکەی س• ئا• یەگیزاروّڤدا کە دەربارەی ئەتنۆگرافیای کورد نووسیویتی[12] چاومان بە دوو فەرهەنگ دەکەوێ : یەك ـ کوردی ـ ڕووسی ( ل ١ ـ ٦٥ ) ؛ دوو ـ ڕووسی ـ کوردی ( ل ٦٦ ـ ١٢٢ ) •

مێجەر سۆن لە پاشکۆی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٩١٣دا لە لەندەن بڵاوی کردۆتەوە[13] فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزی ـ کوردی ( ل ١٧٠ ـ ٢٨٩ ) داناوە • هەروەها لەو کتێبەشیدا کە لە ساڵی ١٩١٩دا لە بەغدا لە چاپدراوە[14] فەرهەنگۆکێکی ئینگلیزی ـ کوردی حەفتا لاپەڕەی بڵاکردۆتەوە •

---

(10) S. A. Rhea, Brief Grammar and Vocabulary of Kurdish Language of the Hakkari districh, Jornal of the American Oriental Society C. X, New-Haven, 1872.

(11) Prym und A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt, I. II, S. Pbg., 1887 - 1890.

(١٢) س . ئا . یەگیزاروّڤ ، لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە . تفلیس ١٨٩١ .

(13) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(14) E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar. Baghdad, 1919.

سالی ١٩١٦یش ف. نیکیتین لە ورمێ فەرهەنگۆکێکی ڕووسی ــ کـوردی بڵاوکردەوە[١٥] و دوای ئەوە بە سێ سـاڵ کتێبی ڕێزمانی میسیونێری ئەمەریکایی ل. و. فاسۆم دەرچوو[١٦] ، کە فەرهەنگۆکێکی شازدە لاپەڕەیی لە گەڵدا بڵاوکردۆتەوە ( ل ٢٦٢ ــ ٢٧٨ ) . هەروەها لـە کتێبەکـەی ر. ف. جاردینْدا کـــە دەربارەی ڕێزمانی کوردی نووسیوێتیو لـە سـالی ١٩٢٢دا لـە بەغـدا بڵاوی کردۆتەوە[١٧] فەرهەنگۆکێکی کوردی ــ ئینگلیزی ( ل ٥٥ ــ ١١٤ ) هەیە .

## ٢ ــ پاش شەڕی یەکەمی جیهان :
### لـە کوردستان

لـە سالانی ٣٠ سەدەی بیستەمدا دەورێکی نوێ لـە مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا دەست پێدەکاتو ئەمەش یەکێك بوو لـە ئەنجامەکانی قوولبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی کە یەکێك لە بەرهەمە ڕۆشنبیرییە گرنگەکانی بریتیبوو لە بایەخ پێدانی خوێندەوارانی کورد خۆیان بە لێکۆڵینەوەی زمانو ئەدەبو مێژووی گەلەکەیان . کاری فەرهەنگ نووسی تا سالانی پەنجا لە چوارچێوەیەکی سستو سادەو ساکاردا مایەوەو ئەوانەی لەو ماوەیەدا بڵاوکراونەتەوەو شایانی باسن بریتین لـە : یەکـەم ــ لیستەی ئەو زاراوە کۆمەلایەتیو سیاسیانەی جەلادەت عالی بەدرخان لە گۆڤاری « هاوار »دا لە سالانی سیدا لە بەشیکی تایبەتیدا لەژێر ناوی « فەرهەنگۆك »دا بڵاوی کردۆتەوە ،

---

(١٥) ف . نیکیتین ، « زاراوەی جەنگیی ڕووسی ــ کوردی » ، ورمێ ، ١٩١٦ .

(16) L. O. Fossum, Practical Kurdish Grammar, Minneapolis, 1919.

(17) R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji, Baghdad, 1922.

دووهەم ــ ئەو زاراوانەی مامۆستا عەلادین سەجادی لە گوڤاری « نزار »دا بڵاوی کردۆتەوەو سێهەم ــ فەرهەنگۆکەکەی مامۆستا شاکر فەتاح کە ساڵی ١٩٣٤ لە چاپی داوە[١٨] .

بەڵام لە ماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییدا ژمارەیەك فەرهەنگی بایەخدار بڵاوکراونەتەوە ، وەك : فەرهەنگی « ڕابەر »[١٩]و « كۆلكە زێڕینە »[٢٠]و « مەهاباد »ی[٢١] مامۆستا گیو موكریانی ، فەرهەنگی مەردۆخ[٢٢] ، فەرهەنگی خاڵ[٢٣] ، «فەرهەنگا کوردی »ی[٢٤] مامۆستا جگەر خوێن ، فەرهەنگەکەی مامۆستا عەلادین سەجادی[٢٥] ، فەرهەنگۆکی عەرەبی ــ کوردی[٢٦] ی عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ،

(١٨) شاکر فتاح ، « فەرهەنگۆك » ، ئینگلیزی ــ کوردی و کوردی ــ ئینگلیزی‌یە ، ڕەواندوز ــ زاری کرمانجی ١٩٣٤ .

(١٩) گیو موکریانی ، « ڕابەر » . فەرهەنگی قوتابخانەیی . عارەبی کوردی‌یە ، هەولێر ١٩٥٠ .

(٢٠) گیو موکریانی ، « کۆلکە زێڕینە » ، فەرهەنگی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی ــ ئینگلیزی ــ فەرەنسایی ، هەولێر ١٩٥٥ .

(٢١) گیو موکریانی ، « مەهاباد » ، فەرهەنگی کوردی ــ عەرەبی ، هەولێر ١٩٦١ .

(٢٢) مەردۆخ ، « فەرهەنگی مەردۆخ » ، کوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ، تاران ١٩٥٦ .

(٢٣) شێخ محەمەدی خاڵ ، «فەرهەنگی خاڵ » . ب ١ ــ ٢ ، سلێمانی ١٩٦١ ــ ١٩٦٤ .

(٢٤) جگەر خوێن ، فەرهەنگا کوردی ، ب ١ ــ ٢ ، بەغداد ١٩٦٢ .

(٢٥) علاءالدین سجادی ، « دەستوور وە فەرهەنگی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی » ، بەغداد ، ١٩٦١ .

(٢٦) عیزەدین مستەفا ڕەسوول ، فەرهەنگۆك بۆ قوتابیانی کورد « عەرەبی ــ کوردی » ، بەغدا ١٩٥٥ .

هەندی زاراوەی زانستی کوردی ـ عەرەبی مامۆستا جەمال نەبەز[27] ، فەرهەنگۆکی زاراوەی پاریزگای سلێمانی[28] ، فەرهەنگی زانیاری[29] ، فەرهەنگی کشتوکاڵ[30] ، زاراوەکانی ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٧٣ی گۆڤاری پەروەردەو زانست ، زاراوی کارگێری کۆڕی زانیاری کورد ... هتد .

**لە یەکێتی سۆڤیێت**

بایەخ دان بە کوردناسی دووای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەوەندەی تر پەرەی سەندو بوونی کەمینەیەکی کورد لەم وڵاتەداو ئەو گۆڕرانە هەرە گەورەیەی بەسەر ژیانی نوێیدا هات بوونە هۆیەکی گرنگ و نوێی گەشەکردنو پێشکەوتنی کوردناسی سۆڤیێتو یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی ئەوە بوو کە پاش ماوەیەك ڕۆڵەکانی ئەم کەمینەیە خۆشیان چاکیان لێکرد بە لاداو چالاکانە هاتنەکۆڕەوە .

هەروەها پەرەسەندنی فەرهەنگنووسیی کوردی ، بێگومان بەستەیە بە پەرەسەندنی کوردناسیی سۆڤیێت خۆیەوەو لە ڕاستیدا یەکێکە لە ڕووە هەرە دیارو گەشەکانی ، بۆ نموونە دەبینین لە ساڵانی ١٩٣٣و ١٩٣٥دا لە یەریڤان دوو فەرهەنگۆکی ئەرمەنی ـ کوردی[31] ، لە ساڵی ١٩٥٧دا چەرکەزی بەکۆ ( بەکاییف ) فەرهەنگێکی کوردی ـ

(٢٧) جەمال نەبەز ، «هەندێك زاراوەی زانستی» ، سلێمانی ١٩٦٠ .

(٢٨) زاراوەی پاریزگای سلێمانی ، ١٩٧١ .

(٢٩) عەبدولقادر بەرزنجی « فەرهەنگی زانیاری » ، سلێمانی ١٩٧١ .

(٣٠) مەعرووف قەرەداغی «فەرهەنگی کشتوکاڵ» ، بەغدا ١٩٧٢ .

(٣١) فەرهەنگۆکی ئەرمەنی ـ کوردی ، یەریڤان ١٩٣٣ ، هەروەها : فەرهەنگۆکی زاراوەی ئەرمەنی ـ کوردی ، یەریڤان ١٩٣٥ .

ڕووسی[٣٢] ؛ لەساڵی ١٩٦٠دا قەناتی کوردۆ فەرهەنگێکی کوردی ــ ڕووسی[٣٣] ؛ وە هەر لە هەمان ســاڵدا ئیڤان فاریزۆڤ فەرهەنگێکی ڕووسی ــ کوردیان[٣٤] لە چاپ داوە . جگە لەوە دەستنووسی ئەو فەرهەنگە کوردی ــ ڕووسیەی کە ئی. ئا. ئۆربیلی لە ساڵانی بیستا نووسیویەتی ، وە ئــەو فەرهەنگی کوردی ( کرمانجی خــواروو ) ــ ڕووسیەی کە لە بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی لێنینگراد بە سەرۆکایەتی کوردۆ دانراوە ئێستا لە ژێر چاپدان .

## لــە ئەوروپــا

لە پاشی دەرچوونی فەرهەنگۆکەکەی ر.ف.جاردین لە کوردناسیی ئەوروپادا بۆ ماوەیەك هەست بە سستیو بێ بەرهەمی دەکرێت بەتایبەتی لە مەیدانی فەرهەنگ نووسیداو تا ئەم ساڵانەی دوواییی لەم بارەیەوە هیچ شتێکی وەها بڵاونەکراوەتەوە کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە لەم ماوەیەی دوواییشدا هاتبێتــە کایەوە تەنهــا فەرهەنگەکانی : جویس بلاو[٣٥] ، تۆفیق وەهبیو ئەدمۆنس[٣٦] ، ئەرنست مەکارۆس[٣٧] .. ن.

---

(٣٢) ج . خ . بەکایێڤ ، فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی ، مۆسکۆ ١٩٥٧ .

(٣٣) ق . کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

(٣٤) ئی . فاریزۆڤ ، فەرهەنگی ڕووسی ــ کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٠.

(35) Joyce BLAU, Dictinnaire kurde - francais - anglais, Paris 1965.

(36) Wahby Taufiq and C. J. Edmonds, A Kurdish - English dictionary, London, Oxford, 1966.

(37) Ernest N. McCarus, A Kurdish - English Dictionary Dialekt of Sulaimania, Iraq. Ann Arbor - The University of Michigan Press.

**ئەنجامی پێشەکی**

تاکو ئێستا نزیکەی (٤٠) فەرهەنگ و فەرهەنگۆکی کوردی بڵاوکراونەتەوە ـ واتە گەنجینەیەکی بچووکمان هەیە • هەرچەندە زۆربەی ئەو فەرهەنگانە ، لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ، لەسەر شێوەو ڕێگایەکی زانستی دانەنراون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە نیسبەت کاری فەرهەنگ نووسیی کوردییەوە چەند هەنگاویکی گەورە نراوەو ژمارەیەك فەرهەنگی سەرکەوتوومان هەیە •

بە نیسبەت فەرهەنگە کۆنەکانەوە بە بیری من دووانیان سەرکەوتوون : ئەوانیش فەرهەنگی ئیتالی ـ کوردی ( ماوریزۆ گارزۆنی )و کوردی ـ فەرەنسایی ( ئاه ژابا )ن •

وەك ئاشکرایە ، ماوەیەکە کاری فەرهەنگ نووسیی کوردی خەریکە جێگەی شایانی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیری و زانستی گەلی کورددا دەگرێت و ژمارەیەك مامۆستای دڵسۆز ، وەك : تۆفیق وەهبی ، قەناتی کوردۆ ، شێخ محەمەدی خاڵ ، گیو موکریانی ، مەردۆخ ، عەلادین سەجادی ، چەرکەزی بەکۆ ، جەمال نەبەز ، ئیڤان فاریزۆڤ ، سەمەندی سیابەند ، جگەر خوێن ••• هتد لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوە • ئەم مامۆستایانە لە دەرگاکەی فراوانەوە چوونە ناو مێژووی ڕۆشنبیری کوردەوە ، بەوەی هەر یەکەیان لە سنووری تواناى خۆیاندا ئەوەی لە باریاندا بووە بۆ پاراستنی زمانی نەتەوەکەیان دڵسۆزانە جێبەجێیان کردووەو گەلێك ڕۆژهەڵاتناسی بێگانە باسی نرخی فەرهەنگەکانی مامۆستایان : تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆو شێخ محەمەدی خاڵیان کردووە •

هەرچەندە لە کاری فەرهەنگ نووسیی کوردیدا هەندێ کێشەی ئاڵۆزی زانستی وشە ( lexicology ) بەگشتی و زانستی فەرهەنگ

( lexicography ) بەتایبەتی خاوکراونەتەوە ، بەلام لەگەل ئەوەشدا گەلێك كێشەی زانستی وشەو زانستی فەرهەنگ لـە زمانی كوردیدا هێشتا بیرو نووكی قەلەمیان نەگەیشتووەتی .

وەك ئاشـــكرایە ، كاری فەرهەنگنووسی بە دوو ڕێچـــكەدا تێدەپەڕێ : یەك ـ تیۆری . دوو ـ پراكتیك . یەكەمیان لە سەر شێوازو لێكۆلینەوەی زانستی ڕێڕەویكی تیۆری دەهێنێتە بەرهەم ، دووەمیش لە دانانی فەرهەنگدا ئەو ڕێڕەوی تیۆرییە تەطبیق دەكات . لە نێوان ئەو دوو ڕێچـــكەیەدا پەیوەندی بەهێز هەیەو توند پێـــكەوە بەستراونو هەنگاو بە هەنگاو لە تەك یەك دەڕۆن . هیچ فەرهەنگنووسێك تەنها بە پراكتیكو زانینی خۆی لە دانانی فەرهەنگدا سەركەوتوو نابێت . بۆ ئەو مەبەستە پیویستە ئاوڕ لە ڕێڕەوی تیۆری بداتەوە . تیۆری ڕووتیش ـ واتە بێ سوود وەرگرتن لە پراكتیك ئەنجامی بەكەلكی نابێت .

ئەوەی شایانی باسە لەم بارەیەوە ئەوەیە كـــە لە دانانی هەندێ فەرهەنگی كـــوردیدا سوودێكی زۆر لـــە تیـــۆری فەرهەنگنووسی وەرگیراوە ، بە تایبەتی لە فەرهەنگی مامۆستایان توفیق وەهبیو قەناتی كوردۆ ... دا ، كە لـــە ڕێگای هەولو كوشش وە زانینو تەجروبەی خۆیانەوە گەیشتوونەتە ئەنجامی بەكەلك ، بەلام بەداخەوە ، بە زمانی كـــوردی دەربارەی زانستی فەرهەنگنووسی هیـــچ شتێكی وەهـــا نەنووسراوەو ئەمەش بووە بە هۆی كۆســـپێكی گەورە لـــە ڕێگای فەرهەنگنووســە بەڕێزەكانماندا .

وەك ئاشكرایە زمانی كوردی بەتایبەتی لە كوردستانی عیراق ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پیشەوە دەرواتو لەگەل ئەو پیشـــــكەوتنەدا پیویستە تیۆری فەرهەنگنووسیش هەنگاوی خۆی بهاوێژی ، وە بە هاوكاری پراكتیكو تیۆری فەرهەنگی نایابو بەنرخ بێنە كایەوە .

مەبەستی هەرە گەورەی ئەم پێشەکیە ئەوەیە کە نیشانی بدەین تاکو ئێستا لە کاری فەرهەنگنووسیی کوردیدا چی کراوە ، چونکە لە دانانی هەر فەرهەنگێکی نوێی کوردیدا ئاوڕدانەوە لە کاری پێشوو بایەخو سوودی خۆی هەیە . هەروەها بەم باسەدا دەردەکەوێ کە بە تایبەتی بەشێکی زۆری ئەو فەرهەنگانەی لــە سەرەوە ناومان بردن کوردی ـ بێگانەن‌و هەر یەکەیان کەم یا زور خزمەتی زمانەکەمانیــان کردووە . جا بە ڕای من لە نووسینی ئەم فەرهەنگەدا ـ فەرهەنگی کوردی‌و عەرەبیی قوتابخانە ـ کە نیاز وایە دابنرێ ، پێویستە چ لە کەم‌و کورتی‌و لە باشی ئەو سامانەی هەمانە دەرس‌و سوود وەربگیرێ .

× × ×

وەك چۆن لە دانانی گشت فەرهەنگێکدا ، هەر بەو جۆرەش لە دانانی فەرهەنگی کوردی‌و عەرەبیی قوتابخانەدا سێ مەسەلەی گرنگ دێتە پێشەوە : هەڵبژاردنی وشــە ؛ سازکردنی بەشە عەرەبیەکــەی ؛ هونەری ڕێکخستنی .

## ـ ١ ـ

## هەڵبژاردنی وشــە

لە سەرەتای نووسینی هەموو فەرهەنگێکدا کێشەی هەڵبژاردنی وشە دێتە پێشەوە . بنچینەی هەڵبژاردنی وشە پەیوەندە بە جــۆرو بابەت‌و مەبەستی فەرهەنگەوە . تاکو ئێستا کێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ لە هیچ ولاتێکی جیهاندا شێوازێکی زانســتی تەواوی وەرنەگرتووەو هەندی ڕووی ئەم مەسەلەیە هەر بە ئاڵوزی ماوەتەوەو

هەروەك زانای گەورەو فەرهەنگ‌نووسی ناسراوو بە ناوبانگی ڕووس ئەکادیمی ل. ف. شێربا دەلی : « کێشەی هەلبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ یەکێکە لە کێشە هەرە زەحمەتەکانی فەرهەنگ‌نووسین »[٣٨] ، بەلام لەگەل ئەوەشدا پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین کە لە تیۆرێی فەرهەنگ نووسیدا هەنگاوی گەورە نراوەو گەلێك کاری ئالۆز خاو کراوەتەوەو ڕێڕەوێکی وەها دانراوە کە فەرهەنگ‌نووسەکان پەیڕەوی بکەن‌و لەڕێگەیەوە لە گەلێك کۆسپ ڕزگاریان بێت . هەروەها دانانی ژمارەیەکی زۆر لە فەرهەنگ ـ واتە لە ئەنجامی هەوڵ‌و کۆشش‌و زانین‌و تەجروبەی فەرهەنگ‌نووسەکاندا سەرمەشقێ هاتۆتە کایەوە .

هەر چەندە مەسەلەی هەلبژاردنی وشە کارێکی زەحمەتە ، بەلام ئەو ڕێڕەوە تیۆری‌و پراکتیکەی کە تا ئەمڕۆ هاتۆتە کایەوە ئەم کارەمان بۆ ئاسان دەکات .

وەك ئاشکرایە مەبەستی زانستی‌ی دانانی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی بۆ قوتابخانە بریتی‌یە لە یارمەتی‌دانی قوتابیانی کورد بۆ تێگەیشتنی دەرسەکانیان . بێ‌گومان فەرهەنگێکی وەها بەر لە هەموو شتێك دەبێ گرنگی بە بەجێ‌هێنانی پێویستی قوتابیان بدات لە تێگەیشتنی گشت دەرسەکانیاندا بە تێکڕایی ، کە بەسەر ئەدەبی‌و عیلمیدا دابەش دەبن .

هەرچی وشەو زاراوەی دەرسە ئەدەبیەکانن تارادەیەك لە زمانی کوردیدا کێشەیان خاوکراوەتەوەو سەرچاوە زۆرە بۆ تۆمارکردن‌و لێکۆلینەوەیان ( وەك : زۆربەی ئەو فەرهەنگانەی لە پێشەکی‌دا ناومان بردن ؛ ئەو هەموو چاپەمەنیە کوردیانەی لە بارەی ئەدەب‌و زمان

---

(٣٨) ل . ف . شێربا ، تیۆریی فەرهەنگ‌نووسی ، مۆسکۆ . ١٩٤٠ ، ل ١٠٦ ( بە زمانی ڕووسی ) .

مێژوو .... وە نووسراون ؛ سامانی فۆلکلۆری کوردی .... ) .
لەبەر ئەوە لە دانانی فەرهەنگەکەدا بە نیسبەت ئەو جۆرە وشـەو زاراوانەوە گیروگرفتی گەورە نایەتە ڕێ .

بەڵام ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە زاراوەی دەرسە عیلمیەکانەوە نابڵێی کارێکی وردو زەحمەتە . چونکە لەم ڕووەوە هێشتا کـەم و کورتی و جیاوازی باوەڕ .... زۆرە . لەگەڵ ئەوەشدا نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە لەم مەیدانەدا چەند هەنگاوێك نراوەو کۆمەڵێك کاری بەنرخ نووسراون . ( وەك : ئەو زاراوە زانستیيانەی لە لایەن چەند لیژنەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دانراون و داڕێژراون و لە چەند ژمارەیەکی گۆڤاری « ڕۆژی نوی »ی ساڵی ١٩٦٠دا بڵاوکراوەتەوە ؛ هەر نە ساڵی ١٩٦٠دا مامۆستا جەمال نەبەز لـەژێر ناوی « هەندێك زاراوەی زانستی »دا فەرهەنگۆکێکی لە چاپدا ، لە ژمارە ( ٤ )ی ساڵی ( ١٩٧٢ )ی گۆڤاری « پەروەردەو زانسـت »دا ژمارەیەك زاراوەی زانستی دانراون و داتاشراون ؛ ماوەیەکی درێژە کە مامۆستا کەمال جەلال غەریب بەم کارە پیرۆزەوە خەریکەو فەرهەنگێکی گەورەی زاراوەی زانستی بۆ چاپ ئامادەکردووە ؛ لـە کۆڕی زانیاری کورد بە شـێوەیەکی زانستی و فراوان گرنگی بەم مەسەلەیە دراوە ... هتد ) .

بێگومان لە دانانی فەرهەنگی کوردی و عەرەبی بۆ قوتابخـانە پێویستە کەڵك لـەو کارانەی ناومان بردن وەربگیرێن و ئەمەش تـا ڕادەیەك ئەرکی سەرشانی دانەرانی فەرهەنگەکە ئاسان دەکات . بەڵام بەداخەوە ، وەك وتم ئەمە کارێکی زۆر زەحمەتە ، جگە لەوە کات و کۆششێکی بێشوماری دەوێ . جا بۆ ئەوەی ماوەیەکی درێژ قوتابیانی کورد بێ فەرهەنگ نەبن و چاوەڕوان نەبن ؛ بە ڕای من وەك لە زۆر وڵات لە سەرەتادا کراوە لای ئێمەش بەو شێوەیە دەست بکرێتێ .

ئەویش ئەوەیە کە ئەو فەرهەنگە بکرێت بە دوو : یەك ـ بۆ دەرسە ئەدەبیەکان ، دوو ـ عیلمیەکان • هەرچی فەرهەنگی یەکەمە جاوەو رەنجی زۆری ناوی‌و تا رادەیەك پێویستی قوتابیان جێبەجێ دەکات ، بەتایبەتی ئەگەر هەوڵ بدرێت لەم بەشەیاندا ئەو زاراوە زانستیانەی زۆر بەکار دەهێنرێن‌و ئاشکرانو بەتەواوی چەسپاون تۆمار بکرێن‌و بخرێنە ناوەوە • هەروەها نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە گەلێك زاراوەی عیلمی ( وەك : هەلامەت ، ئالو ، سیل ، پووك ، گۆپکە ، نیشك ، تەم ، مژ ، مس ، ئاسن •••• ) و سەدانی تر هێندە لەسەر زارن کە شێوەی زاراوەیان تێدا وەو کەوتوونەتە ریزی ئەو وشانەی لە هەموو کات‌و شوێنێکدا بەکار بهێنرێن •

هەرچی فەرهەنگی دووەمیانە کارێکی زەحمەت‌و وردەو پێویستی بە کۆشش‌و کات هەیە • بێ‌شك باشترە کە ئەم ئەرکە بخرێتە سەرشانی لیژنەیەك ، بە مەرجێك ئەندامانی لیژنەکەش تەنها ئەو کەسانە نەبن کە لە دەرسە عیلمیەکاندا شارەزاییان هەیە ، یاخود تەنها کوردی‌زان بن • چونکە هیچ دەستەیەك لەو دوو دەستەیە بەتەنها ئەم کارەیان بە باشی بۆ هەڵناسورێ • شارەزای دەرسە عیلمیەکان لە واتاو مانای زاراوەکان باشتر دەگات وەك لە کوردی زان ، هەروەها کوردی زانیش باشتر وشەی هاوواتا بۆ زاراوەکان دەدۆزێتەوە • ئەم شێوازەش ئەوەیە کە ئێستا کۆری زانیاری کورد لە سەری دەروات ، بە وێنە لە لیژنەی « طبی »دا جگە لە دوو دوکتۆری ناسراوو شارەزا ( جەمال رەشیدو عەبدورەحمان عەبدوللا ) دوو کوردی زانی بە ناوبانگ ( هەژار و هێمن ) هاوبەشن • بێ‌شك بەم جۆرە ئەم کارە گەلێك پوختەترو سەرکەوتووتر دەبێت •

هەروەها نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە کوردی زانیش پێویستە

شارەزای دیالێکتەکانی کوردی بێت ، یاخود چەند کەسێك بن کە هەریەکەیان شارەزاییان لە دیالێکتێکدا هەبێت . بە ڕای من گرنگی دان بە یەك شێوەو فەرامۆش کردنی ئەوانی تر ، نەك ڕاست نیە ، بەڵکو دەبێ بە هۆی بوونی کەم و کورتی .

لێرەدا ئەوەش دەهێنمەوە یاد کە بەکارهێنانی هەندێ زاراوەی لاتینی لە باتی عەرەبی پێویست بە سڵکردنەوە ناکات ، چونکە ئەمە نەك هەر لەگەڵ بنچینەی زمانەکەماندا بە تایبەتی و پێشکەوتنی زماندا بەگشتی دەگونجێ ، بەڵکو بۆ وەزعی کوردستانی دابەشکراومان سودمەنترە ...

ئەو پێشنیارەی لە دابەش کردنی فەرهەنگەکەدا کردوومە نابێ بە هۆی ئەوەی تا سەر دوو فەرهەنگی قوتابخانە هەبن ، بەڵکو ئەمە بۆ سەرەتایەو چۆن زۆر فەرهەنگ ١٠ — ١٥ جار لە چاپ دەدرێنەوە ، ئەمانیش لە کاتی لە چاپدانەوەدا دەتوانرێ لێك بدرێن و بکرێن بە یەك فەرهەنگ . بەڵام گرنگی ئەم شێوازە ئەوەیە کە کارەکە ئاسان دەکاو ڕێگاکە نزیك دەخاتەوە .

بە بیری من لە تۆمارکردنی وشەدا بۆ فەرهەنگی کوردی و عەرەبی قوتابخانە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە وشە لە ناو کتێب و وتووێژی قوتابخانەدا کۆ بکرێنەوەو هەڵبژێرێن . پاش ئەوەی کۆدەکرێنەوە . ئنجا دەبێ بژار بکرێ — واتە ئەو وشانەی بۆ ئەم مەبەستە زۆر پێویست نین لابرێن و ئەو وشانەی پێویستن و نین و یاخود پەرێنراون بهێنرێنە ناوەوە . بۆ ئەم مەبەستە چەند شێوازێکی زانستی هەیە کە وا بەکورتی لە هەندێکیان دەدوێین :

أ — لە هەموو زمانێکدا وشە هەن کە یەك چاوگ و یەك ڕیشەیان هەیەو لەیەك وشە دەتوانری هەندێ وشەی تر دروست بکرێ ، وەك :

« مناڵ ، منالی » ؛ « نان ، نانەوا » ؛ « هونەر ، هونەرمەند » ؛ « شیعر ، شاعر » ... هتد . جا لەم ڕێگەیەوە پاش کۆکردنەوەی وشە پێویستە هەر وشەیەك بەجیا تەماشا بکریٔو لەم بارەیەوە گەر ئەو وشانەی کە دەتوانرێ لێیان دروستبکرێو بخرێنە بان وشەکان . بێگومان مەرج نییە کە لە هەموو وشەیەك وشەیتر دروست بکرێو یاخود هەموو ئەو وشانە بکەونە ناو فەرهەنگەکەوە ، بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر نەکرێ کە بە کەمو کورتیەکی گەورە دەژمێرێت گەر وشەی « مناڵ » هەبێتو « منالی » نەبێت ، یاخود « شاعر » هەبێتو « شعر » نەبێت[٣٩] .

ب ــ ئەو وشانە کە کۆکرانەوە دەبێ بە گوێرەی بابەت لێ بکۆلرێتەوەو هەر پۆلێکیان بە گوێرەی نیسبەتی کەوتنە ناو فەرهەنگەکەوە دەستکاری بکرێن ــ واتە ئەوەی بەزیادە دەزانرێ لابرێو ئەوەی کەمیشە پڕ بکرێتەوە . بە ڕای من دەتوانرێ وشەکانی فەرهەنگی ناوبراو بەم جورە دابەش بکرێ :

١ ــ ئەو پۆلە وشانەی کە سەراپا ، بێ پەڕاندنو لابردنی هیچ وشەیەك پێویستە تۆماربکرێن ، وەك : ناوی ڕۆژەکانی هەفتە ؛ مانگەکان ؛ چوار وەرزەی ساڵ ... هتد . پەڕاندنی هەر وشەیەك لە وشەکانی ئەو جورە مەوزوعانە ڕاست نییەو هیچ بەڵگەیەك نیە بۆ سەلماندنی لابردنو پەڕاندن .

٢ ــ ئەو پۆلە وشانەی کە پێویستە بەشێکی زۆریان لێ تۆماربکرێن ، وەك : ناوی ئەندامەکانی لەش ؛ ناوی کەرەستەی قوتابخانە ... هتد .

---

(٣٩) ئەم جۆرە کەمو کورتیانە لە بەشێکی زۆری فەرهەنگە کوردیەکاندا دەبینرێنو پێویستە لێرەدا دەرس لەوە وەربگرین .

٣ ــ ئەو پۆلە وشانەی کە پێویستە بەشێکی کەمیان لێ تۆماربکرێن ، وەك : ناوی دەرمان ؛ گژوگیا (هەلز ، خەربەنگ ، کێشە ، شنگ ؛ بێخ ...) ... هتد . هەروەها هەندێ لەو وشانەی کە لە زمانی کوردی بەرەو سوانو کۆنبوون دەچنو بە هۆی گۆڕرانی ژیانی ئابوریو کۆمەڵایەتیەوە کەمتر بەکار دەهێنرێن ، بۆ نموونە : ناوی ئەو وشانەی پەیوەندیان بە ئاشی ئاوەوە هەیە یاخود ئەو وشانەی لە پەیوەندیی خێزانیدا بەکاردێن ، وەك : هەوێ ، هێوەرژن ، دش ، هەنەزا .... هتد . بەداخەوە هەست دەکرێت ئەو وشانەی کە ناومان بردن هەندێ دەستەواژە جێگایان دەگرنەوە ، وەك لە جێگای « دش » ــ « خوشکی مێرد » ... ئەم جۆرە وشانە کەم بەکاردەهێنرێنو بۆ ئەم فەرهەنگەش پێویست نین .

جگە لەوەی باسمان کرد ، بۆ کۆکردنەوەو بژارەی وشە بۆ فەرهەنگ هەندێ ڕێگای زانستی تریش هەیە ، کە بە داخەوە لێرەدا توانای ئەوە نییە لە هەمووی بدووێین ، بەڵام ئەوەی کە گرنگ بێت لە مەسەلەی دانانی فەرهەنگێکی کوردیو عەرەبیی قوتابخانەدا ، ئەوەیە کە ئەو فەرهەنگە بەر لە هەموو شتێك دەبێ پێویستی قوتابیان جێبەجێ بکاتو کاریان ئاسان کات . بە ڕای من ژمارەی وشە کوردیەکانی فەرهەنگی یەکەم گەر دەورو بەری بیست هەزار وشەیەك بێت ، بە مەرجێك لە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشەدا وردەکاری بنوێنرێت ، کە من لەوەدا شکم نیەو باوەڕم بە زاناکانمان بەهێزە ، ئەوە ئەو فەرهەنگە چارەسەری پێویستی قوتابیانی کورد دەکات . ژمارەی وشە کوردیەکانی فەرهەنگی دووەمیش بەستراوە بە ژمارەی ئەو زاراوانەی لە دەرسە عیلمیەکاندا هەنو خەملاندنیان شتێکی گرنگ نیە .

— ٢ —

## سازکردنی بەشـە عەرەبیەکـەی

ا — وەرگێڕان :

وەك ئاشکرایە لە نێوان وەرگێڕانو تیۆریی نووسینی فەرهەنگێك کە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکیتر بێت پەیوەندی بەهێز هەبەو بنچینەی وەرگێڕانیش بایەخێکی تەواوی هەیە لە دانانی ئەو جۆرە فەرهەنگانەدا ، هەروەها ئـەو فەرهەنگانەش لـــە کاری وەرگێڕاندا کەڵکێـــکی زۆریان هەیە(٤٠) .

هەرچەندە لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی تیۆری هیچ نووسراوێکی وەهامان نیيە کە شایانی باس بێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك شت لـــە عەرەبیەوە بو کوردی ، یاخود لـــە کوردی‌یەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕراونو لەم ڕووەوە تەجروبەو سامانێکی باشمان هەیە . ئەمەو هەروەها سوود وەرگرتن لە تیۆریی وەرگێڕانی وڵاتە پێشکەوتومکان ڕێگامان ئاسان دەکەن لـــە نیشانکردنی جۆری وەرگێڕانی وشـــە کوردديیەکانی ئەم فەرهەنگەمان بۆ سەر زمانی عەرەبی .

بێ‌گومان لـــە نووسینی فەرهەنگێکی وەهادا ، بۆ وەرگێڕانو لێکدانەوەی وشـــە کوردیـــەکان بەتایبـــەتی وەرگێـــڕانی مطلق

(٤٠) ئا . ف . فیێدوروف ، تیۆریی وەرگێران ، مۆسکۆ ١٩٥٨ ، ل ٥ — ٦ .

( absolute ) و جـــزئی ( partial ) و • شـــهـ ح ( description ) پێویسته دەوری سەرەکی ببینن •

وەرگێڕانی مطلق ( absolute ) ئەوەیە کە مانای وشەیەك بەیەك وشە بدرێ • گەر بو وشەیەکی کوردی لە زمانی عەرەبیدا بەرامبەری وشەیەکی پڕ بەپێستی خۆی هەبێتو کە بەتەواوی مانای ئەو وشەیە بداتو ئەو وشەیەش وشەیەکی ئاسانو سادەو ساکار بێت ، ئەوە پێویست بە درێژە ناکات ، وەك :

باران ــ مطر

بەران ــ کبش

بەی ــ سفرجل

چاو ــ عـین

وەرگێڕانی جزئی ( partial ) ئەوەیە کـە هەر وشەیەك یەك مانا لە ماناکانی وشە زۆر ماناکان ( polysemantic ) بدات ؛ وەك :

چـار ــ أربعه • علاج ••

چـەك ــ سند • سلاح ••

جگە لەو دوو جۆر وەرگێڕانەی لە سەرەوە باســـمان کردن ، هەروەها وەرگێڕانی کومەلە وشەی هاوواتا ( مرادف ــ Synonym ) دەورێکی گەورەو دیاری هەیە • زور جار بەرانبەر یەك وشەی کوردی لە زمانی عەرەبیدا چەند وشەیەك بەکار دەهێنرێن ( وئەمەش لە هەموو زمانێکدا هەیە ) • جا بۆ لێکۆلینەوەی مانای یەك وشـەی کوردی بەکارهێنانی چەند وشەیەکی یەكهاوتای عەرەبی نیشانەی دەولەمەندیو پوختی وەرگێڕانەو لە سەرێکی تریشەوە تێ‌گەیشتنی مانای وشە ئاسان دەکات • لەم ڕووەوە چەند نموونەیەك لـە فەرهەنگی « مەهاباد »ی مامۆستا گیو موکریانیەوە دەهێنمەوە :

بەندە ــ غلام ، خادم ، عبد
تەمەن ــ العمر ، السن
جیگا ــ موقع ، محل
...... هتد .

هەروەها رێدەکەوێ بەرانبەر وشەیەکی کوردی لـــە زمانی عەرەبیدا دەستەواژەیەك ( عبـــارە word - combination ) بەکـــار دەهێنرێ ، ئەم جۆرە وەرگێرانەش بایەخی خۆی هەیەو لە مەسەلەی زانستی وشـــە (lexicology )دا جیگای تایبەتی وەرگرتووە . دیسان چەند نموونەیەك لە فەرهەنگی « مەهاباد »ەوە :

تریفە ــ ضوء الهادی
توراخ ــ اللبن المکثف
جـــاو ــ خام أسود
...... هتد[41] .

شەرح ( description ) ی وشە بەتایبەتی پێویستە لـــە کاتێکدا بەکار بهێنرێ کە لە زمانی عەرەبیدا وشەیەکی هاوواتا نەبێت بۆ دانی مانای وشەیەکی کوردی . هەروەها « فەرهەنگنووس دەبێ گرنگی بدات بەوەی شەرحی وشەکان بەکورتی بکات ، بەمەرجێك ئەو کورتیە نەبێ بەهۆی نەکردنەوەو ئاشکرانەبوونی مانای وشەکان »[42] . جگە لەوە پێویستە شەرح کراوەبێتو بە وشەی ئاسانو سادە بێت .

---

(٤١) لێرەدا گرنگیم بەوە نەداوە کە مامۆستا گیو موکریانی تـــا چ رادەیەك لە وەرگێرانو لێکدانەوەدا سەرکەوتووە ، بەڵکـــو بایەخم بەو شێوازە زانستیە داوە کە گرتوویەتی .

(٤٢) ئا . ك . باروفکوف ، لـــە تەجروبەی فەرهەنگ داناندا ، گوفاری « فەرهەنگنووسی » ، مۆسکۆ ١٩٥٧ ، ل ١٤٠ ، ( بە زمانی رووسی ) .

بێ‌شك ئەوعیەتی فەرهەنگەکە پەیوەندی تەواوی بەوەوە هەیە کە چون وشەی کوردی وەردەگیرێتە سەر زمانی عەرەبی‌و چون مانایان لێك دەدرێتەوەو شی دەکرێنەوەو شەرح دەکرێن ...

**ب – ڕوونکردنەوەی مانای وشەو چۆنیەتی بەکارهێنانی :**

یەکێ لە ئەرکە سەرەکیەکانی فەرهەنگی کوردی – بێگانە ڕوونکردنەوەی مانای وشەیە . جگە لەوە نیشاندانی چۆنیەتی بەکارهێنانی وشەش شتێکی پێویستە لە کاری فەرهەنگنووسیدا . بۆ سەلماندنی ئەم ڕایە زانایانی ڕووس ، بەتایبەتی ل. ف. شێرباو ڤ. ڤ. ڤینۆکرادۆف و ن. ئی. فیلدمان ... گەلێك لێکۆڵینەوەی زانستیان بڵاوکردۆتەوە .

بێ‌گومان بۆ تێگەیشتنی هەندێ وشە ڕوونکردنەوە دەورێکی گرنگی هەیە . ئەمەش لە سەرێکەوە کاری خوێنەر ئاسان دەکاو لەسەرێکی تریشەوە شێوازێکی زانستی دەدات بە داتانی فەرهەنگەکە . لەم ڕووەوە چەند نموونەیەك لە فەرهەنگی « مەهاباد »ی مامۆستا گیو موکریانی‌یەوە دەهێنمەوە :

شەهێن – شاهێن ( طائر ) ل ٣٩٢

فەرەنگ – الافرنج ( سکان أوروبا ) ل ٤٠٨

کاوڕ – الحمل ( نتاج الغنم لم یکمل سنة من عمره ) ل ٤٥٦

. . . . . هتد .

هەروەها پێویستە بەشێکی زۆری وشەکان بخرێنە ناو ڕستەیەکی کورت‌و ئاسانەوە ، تاکو مانای وشەکان باشتر ئاشکرابێ‌و تا خوێنەر لەو ڕێگایەوە بزانێ چۆن ئەو وشانە لە ڕستەدا بەکار دەهێنرێن . جگە لەوە ل. ف. شێربا دەڵێ : بەپێی وشەی زمانێك لەگەڵ زمانێکی تردا

تەنها ئەوە نییە کە بەرامبەر یەکن‌و هاوواتان ، بەڵکو پەیوەندی ئاڵوزو جیاواز هەیە لە شێوەی بەکار هێنانیاندا[٤٣] •

بۆ نموونە لە فەرهەنگی « مەهاباد »دا دەبینین کە بەرامبەر بە وشەی « سەیر » نووسراوە « غریب » ، وە لە فەرهەنگی مامۆستا تۆفیق وەهبی‌دا لە بەر دەم وشەی « جرج » نووسراوە « rat » • لەبەر ئەوەی لە زمانی عەرەبیدا « غریب » ، وە لە ئینگلیزیدا « rat » چەند مانایەکی جیاوازیان هەیە ، بۆ خوێنەر مانای تەواوی ئەو وشانە ئاشکرا نەبوون ، بەڵام گەر ئەو دوو وشەیە « غریب و rat » بخرانایە ناو ڕستەیەکی کورتی ئاسانەوە ئەوە مانایان باشتر ڕوون دەبوەووە • بەڵام دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە ئەمە بۆگشت وشەیەك نییە ، چونکە زۆر وشە هەن کە ئاسانن‌و زۆر بەسەر زاری مەردومەوەن ، یاخود لێكدانەوەی مانایان ئاسانەو بێ ڕستەش ئاشکران •

ج ـ هەڵبژاردنی مانای وشە :

لە زمانی کوردیدا وەك زمانانی تر گەلێك وشەی ئەوتۆ هەن کە زیاتر لە مانایەك دەبەخشن ( polysematic ) • بە وێنە لە فەرهەنگی خاڵدا بەرامبەر وشەی « بۆ » یازدە مانا دانراوە • ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە فەرهەنگی کوردی‌و عەرەبی‌ی قوتابخانەوە ؛ ئەوەیە کە نە تواناا هەیەو نە پێویست دەکات هەموو ماناکانی هەر وشەیەك نیشان بدرێ ، چونکە ئەمە ئەرکی فەرهەنگی گەورەی کوردی ـ کوردییە ، نەوەك فەرهەنگێك کە بۆ خوێندن دانرابێت • جا بۆ ئەم فەرهەنگە پێویستە کە ئەو مانایانەی ئاشکران‌و ناسراون‌و زۆر بەکاردەهێنرێن هەڵبژێرێن‌و تۆماربکرێن • لەم ڕووەوە زمانناس‌و فەرهەنگ‌نووسی بەناوبانگی ئیسپانی ( کاسارێس ) پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە لەو

---

(٤٣) سەرچاوەی ناوبراو ، ل • ف • شێربا •

جۆرە فەرهەنگانەدا خوێنەر بە دووای مانای سەرەکی‌دا دەگەڕێ‌و بەنیسبەت ئەوەوە ئەو مانایانەی ئاشـــکرانو زۆر بەکار دەهێنرێن گرنگن • هەروەها لەوەش دوواوە کە فەرهەنگ‌نووس لەم مەسەلەیەدا ـ واتە لە هەڵبژاردن‌و لێکۆڵینەوەی مانادا پێویستە وردبێ[٤٤] •

جگە لەوە پێویستە ئەوە لە بیر نەکەین کە لە دانی مانای وشەدا بۆ ئـەم فەرهەنگە باشتر وایە تەنهـا مانای حقیقی ( direct ( proper meaning بدرێت ، چونکە لەگەڵ مەبەست‌و ڕێبازی ئەم فەرهەنگەدا دانی مانای مجازی ( transfereed meaning ) بە تەواوی ناگونجی‌و هەروەها باری فەرهەنگەکەش گران دەکات •

— ٣ —

## هونەری ڕێکخستنی فەرهەنگەکە

### ا ـ ڕیزکردنی وشە کوردییەکان :

بۆ ئەم جۆرە فەرهەنگانە تاکە ڕێگای ڕیزکردنی وشە ئەوەیە کە بەگوێرەی ئەو زنجیرە ئەلفوبێیە بێت کـە لـە نووسینی کوردیدا هەیە[٤٥] • بێ‌شك بەمە خوێنەر لە دۆزینەوەی وشەدا هیچ گیروگرفتێك نایەتە ڕێگای‌و بە ئاسانی ئەو وشەیەی پێویستی بێ دەبدۆزێتەوە •

---

(٤٤) خ. کاسارێس «سەرەتایەك لە کاری فەرهەنگ‌نووسیی نوێ» ، ن . ئا . ئاروتونۆڤا کردوویە بە ڕووسی ، مۆسکۆ ١٩٥٨ ، ل ٨٧ .

(٤٥) هەندێك لە فەرهەنگەکانمان لە سەر ئەو ڕێگەیە نەڕۆیشتوون‌و ئەمە بووە بە هۆی گران بوونی دۆزینەوەی وشە . هەروەها بەداخەوە تاکو ئێستا لە ڕیزکردنی ئەلفوبێی کوردیدا ڕێبازێکی یەك‌گرتوو نییە .

## هاوبێژی

ب ـ وشەی هاوکۆ ( مشترك لفظي homonym ) :

لە گشت زمانێکدا وشە هەن کە بە خوێندنەوەو نووسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە ، وەك :

( ئازار ) ئێشی ئەندام . مانگی مارت کە سیو یەك رۆژە .

( باقە ) چەپکێك لە گیا یا لە گوڵ . دەنگێکە وەك دەنگی بزنو رێوی .

( باو ) دەستور : فیسار شت بووە بەباو . باوك . زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا .... .[٤٦]

ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن لەو وشانە نین کە مانایان زۆرە ، بەڵکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوەو نووسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتاو پەیدا بووندا جیاوازن ، وەك : ( « ئازار » ئێشی ئەندام ) کە وشەیەکی کوردییە زۆر دوورە لە ( « ئازار » ـ مانگی مارت ) کە وشەیەکی کوردی نییەو لە پەیدابوونو دروستبووندا سەرچاوەیەکی تری هەیە . یاخود « باو » دەبینین سێ وشەن کە مانایان جیاوازەو لە یەك دوورن . هەرچەندە هەرسێکیان لە نژادا کوردین ، بەڵام پەیدابوونو دروستبوونیان لە رێگای جیاوازەوە هاتووە . جا ئەم جورە وشانە پێویستە لێك جیا بکرێنەوەو تێکەڵ نەکرێنو لە فەرهەنگیشدا وەك ئەو شێوەیەی لە سەرەوە نووسراون ـ واتە بەیەك وشە دانراون[٤٧] ـ

---

(٤٦) ئەو وشانە لە فەرهەنگی خاڵدا بەو شێوەیە شەرح کراونو بەو شێوازە دانراون .

(٤٧) لە زۆربەی فەرهەنگە کوردییەکاندا ئەو وشانەی ناومان بردن بەو وشانە دانراون کە مانایان زۆرەو لە وەرگێرانو لێکدانەوەو شەرحکردنیاندا لە نێوانیاندا خاڵێك دانراوە . ئەمەش بە هیچ جۆرێك راست نییە ، چونکە ئەمانە وشەی فرەواتا ( polysemantic ) نین ، بەڵکو وشەی هاوکۆ ( Synonym ) ن .

نەکرێت ، بەڵکو باشترە دانەرانی ئەم فەرهەنگە لە سەر ئەو ڕێگایە بڕۆن کە گشت فەرهەنگنووسانی ، ولاتە پێشکەوتووەکانو هەندێك لە زانا کوردەکان ( تۆفیق وەهبیو قەناتی کوردۆو بەکاییڤو تا ڕادەیەك گیـو موکریانی .... ) لە سەری ڕۆیشتوون . ئەو ڕێگایەش ئەوەیە کە ئەو وشانەی ناومان بردنو بەیەك وشە دانراونو خراونەتە ڕیزی ئەو وشانەی کە ماناکان زۆرە ( polysemantic ) ، جیا بکرێنەوەو بە وشەی جیاوازو سەربەخۆی هاوگۆ ( homonym ) دابنرێنو سەرلەنوێ لەسەری دێر وەك وشەیەکی تایبەتی بنووسرێنو ژمارەیان بۆ دابنرێت . بۆ نموونە :

( ئازار )[1] ئێشی ئەندام .
( ئازار )[2] مانگی مارت ....

( باقە )[1] چەپکێك لە گیا یا لە گوڵ .
( باقە )[2] دەنگێکە وەك دەنگی بزنو ڕێوی .

( بـاو )[1] دەستور : فیسار شت بووە بە باو .
( بـاو )[2] بـاوك .
( بـاو )[3] زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا .

ئەم جورە وشانە ــ ( homonym ) لە زانستی وشەدا بایەخی تایبەتی خۆیان هەیەو لە کاری فەرهەنگنووسیشدا سەرنجی زانایانیانی ڕاکێشاوە . بەڵام لە زمانی کوردیدا ئاڵوزە ، چونکە هیچ لێکۆڵینەوەو نووسراوێکی وەها لە بارەیانەوە نییە .

ج ــ وشەی فرەواتا ( کثیر المعانی polysemantic ) :

چۆن لە هەموو زمانێکدا ، هەروەهاش لە زمانی کوردیدا وشە هەن کـــە تەنها یەك مانایان هەیەو وشەش هەن کـــە مانایان زۆرە ( polysemantic ) . بۆ نموونە دەبینین کە هەندێ وشـــە ، وەك :

( شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ .... هتد ) لەیەك مانا زیاتریان نییە ، بەڵام وشەش هەن مانایان زۆرەو ئەو مانایانەش لەیەك نزیکن ، وەك : ( بەردانەوە ، با ، بازاڕی ، بانگ .... هتد )[٤٨] .

بۆ ئاسانکردنی بەکارهێنانی فەرهەنگو کیشانی سنوور لە نێوان ماناکانی یەك وشـەدا باشتر وایە ماناکان بە ژمارە جیـا بکرێنەوە . ئەوانەی فەرهەنگ بەکار دەهێنن لەم ڕێگەیەوە لـە تێگەشتنی مانای وشەدا تووشی هەڵەو زەحمەت نابن و ئەو زاتانەش کـە فەرهەنگەکە دادەنێن ، جـگە لەوەی بەم کارە شێوازێکی زانستی بە فەرهەنگەکە دەدەن ، هەروەها هەندێ کێشەی زانستی وشەش خاو دەکەنەوە .

لە زوربەی فەرهەنگە کوردییەکاندا جگە لە فەرهەنگی ( تۆفیق وەهبیو قەناتی کوردۆو بەکایێفو ... تا ڕادەیەك فەرهەنگی خاڵیش ) دەبینین ماناکانی ئەو وشانە بە خاڵێك جیاکراونەتەوە . بۆ نموونە وشەی « بەردانەوە » لە فەرهەنگی خاڵەوە دەهێنینەوە :

(بەردانەوە) بەردانەوەی ئاوی گیراو . فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە .

بەڵام باشترە بە ژمارە جیابکرێنەوە ، وەك :

(بەردانەوە) ١ ـ بەردانی ئاوی گیراو .

٢ ـ فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە .

چونکە ئەمە جیاوازی ئەم جۆرە وشانە لەگەڵ وشەی هاوگۆدا نیشان دەداو لە بەکارهێنانی فەرهەنگەکەشدا کاری خوێنەر ئاسـان دەکات ....

---

(٤٨) بۆ زانینی مانای ئەو وشانە بڕوانە « فەرهەنگی خاڵ » ، ب ١ ، سـلێمانی ١٩٦٠ .

د ـ وشەی هاوواتا ( مرادف synonym ) :

بەو وشانە دەڵێن کە یەك مانا دەبەخشن یاخود مانایان لێك نزیکە ، بەڵام لە خوێندنەوەو نووسینیاندا جیاوازن ، وەك : لێڕ ـ دارستان ـ جەنگەڵ ؛ پەڕیوە ـ ئاوارە ـ دەربەدەر ؛ جەندەك ـ کەلاك ـ تەرم ـ کەلەش ؛ ئەوین ـ ئەڤین ـ عەشق ـ دڵداری ؛ تووش ـ دژوار ـ سەخت ـ ناخۆش ؛ کەسەر ـ خەم ـ خەفەت ؛ خاپور ـ وێران .... هتد .

بۆ فەرهەنگی ناوبراو پێویست بە وەرگێڕانو لێکدانەوەو شەرحی هەموو ئەو وشانە ناکات ، بەڵکو باشترە مانای وشەی یەکەمیان[49] ( یاخود هەرە ناسراویان ) بدرێتو لە بەردەم ئەوانی تردا بنووسرێ : بڕوانە فلان وشە[50]و ، ئەگەر جیاوازییەکیش لە نێوان واتایاندا هەبێت بنووسرێت .

بۆ نموونە مامۆستا تۆفیق وەهبی لە فەهەنگەکەیدا بەرامبەر بە وشەی « pîwaz » نووسیوێتی « see piyaz » و بەرامبەر بە وشەی « weten » — « see nîshtman » ، وە لە شوێنی خۆیدا وشەی « piyaz » و « nîshtman » ی لێکداوەتەوە . هەروەها لە فەرهەنگی « مەهاباد »ی مامۆستا گیو موکریانیدا لە بەردەم وشەی « مچوورك » نووسراوە « انظر کلمة مووچڕکە »و لەبەردەم وشەی

---

(٤٩) واتە بەگوێرەی زنجیرەی ئەلفوبێی کوردی .

(٥٠) هەرچەندە لە زۆر فەرهەنگی کوردیدا ئەم ڕێگایە نەگیراوە ، بەڵام بەتایبەتی مامۆستایان ( تۆفیق وەهبی و تەناتی کوردۆو چەرکەزی بەکۆ و .... تا ڕادەیەك گیو موکریانی )و هەروەها دانەرانی زاراوی کارگێڕی کۆڕی زانیاری کورد ... لەم ڕووەوە هونەری بەرزی خۆیان نیشان داوە .

« مەرشە » ــ « انظر كلمة دەمەقالێ »و ، بە جیا لە شوێنی خۆیدا وشەی « مووچڕكە »و « دەمەقالێ » لێكدراونەتەوە ...[51] .

ئەم شێوەیە نەك هەر ڕێگا كورت دەكاتەوە ، بەڵكــو نیشانی خوێنــەریشی دەدادات كە « وەتەن »و « نیشــتمان » ، « ئەوین »و « ئەڤین »و « عەشق »و « دڵداری » ، « خاپور »و « وێران » ... هتد خاوەنی یەك مانان . هەروەها بەمەش یەكێك لــە كێشەكانی زانستی وشە خاو دەكرێتەوە .

هـ ــ هەندێ نیشانە بۆ ئاســانكردنی كاری چــاپو سووك كردنی باری فەرهەنگ :

بۆ ئاســانكردنی كاری چاپو سووك كردنی باری فەرهەنگو خوێنەران چەند نیشانەیەك بەكار دەهێنرێ . یەكێك لەو نیشانانە ئەوەیە كە لە كاتی خستنە ڕستەی وشەیەكدا بۆ دووبات كردنەوەی وشــەكە هێڵێك بەم جۆرە ( ــ ) دەكێشن ، وەك :

( دڵ ) لــە ــ دەرچوون .

( كار ) ــ لە ــ ترازان .

بێ گومان ئەم شێوازە ڕێگە كــورت دەكاتەوەو باری چاپەمەنی ئاسان دەكاتو هەر لەبەر ئەوەشە كە لــە تێكڕایی فەرهەنگی وڵاتە پێشكەوتووەكاندا پەیڕەوی دەكرێو هەروەها مامۆســــتایان تۆفیق

(51) لێرەدا گرنگیم بە كەموكورتی ئەو ڕێگایانە نەداوە ، بەڵكــو مەبەست نیشــاندانی ئەوەیە كە چۆن هەندێ لە فەرهەنگ نووسانی كورد لەسەر ئەو ڕیگایە ڕۆیشــتوون . هەروەها بۆ فەرهەنگی كوردی ــ عەرەبی ، وابزانم لە باتی « انظر كلمة ... » باشترە كە بۆ ئەو مەبەستە نیشــانەیەك دابنرێ ، وەك « أ » یاخود « أن » ، و لــــە پێشــەكی فەرهەنگەكــــەدا باس بكرێت .

وەهبی‌و قەناتی کوردۆو چەرکەزی بەکۆش لە سەری ڕۆیشتوون(٥٢) •

هەروەها زۆر جار بۆ ڕوونکردنەوەی وشەیەك لــە نێوان دوو کەواندا دەنووسن کە ئەو وشەیە ســەر بە چی پۆلە وشەیەکە ، وەك ( نبات •••• وشەی فلان شێوە •••• ) • بۆ ئــەم مەبەستە باشترە پیتێك بکرێت بە نیشان‌و لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا باس بکرێت •

× × ×

بێ‌گومان بەم لێکۆلینەوەیە نەخشەی تەواوی نووسینی فەرهەنگی کوردی‌و عەرەبی‌ی قوتابخانەم نەکێشاوەو هەندێ کێشە هەن کە باسم نەکردوون ، بەلاَم بە تێکڕایی لەکاری سەرەکی دوواوم • هەروەها مەرج نیە کە لە کاتی دانانی فەرهەنگەکەدا هەموو ئەو ڕێگایانەی پەنجەم بۆ ڕاکێشــاون بەو جۆرە بکرێت ، چونکە وەك ئاشکرایە ، لەگشــت زانستێکدا لە کاتی تەطبیقی کارێکدا ئەو پرۆژەیەی بۆی دانراوە دوور نیە گۆڕانی پێویست بێت •

لە کۆتاییدا خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم گەر منیش بتوانم تۆزێك باری سەرشانی دانەرانی فەرهەنگی ئاوبراو ئاسان بکەم • بێ‌گومان

---

(٥٢) لێرەدا تەنها مەبەست ئەوە نیە کــە تەنها ڕەگی وشــــەکان بنووسرێن‌و ئینجا ئەو وشانەی لێیانەوە دروست دەبن لە دوایەوە بێن ـ واتە ئەو ڕێگەیەی مامۆستا تۆفیق وەهبی‌و گەلێك زانای ڕۆژئاوا لەسەری ڕۆیشتون . بە بیری من پەیڕەوی کردنی ئەو ڕێبازە لە فەرهەنگی کوردی ـ عەرەبی‌ی قوتابخانەدا ، لەگەل ئەوەشدا کە کاری چاپ ئاسان دەکات ، بەلاَم دۆزینەوەی وشە بۆ قوتابیان ئاسان ناکات‌و هەروەها لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا لێکۆلینەوە لەو مەسەلەیە کەمە دوور نیە کە هەندێ وشە بە هەلە نەکەونە ژێر ڕەگی خۆیانەوە .

هەر هەنگاوێك لەم مەیدانەدا بنرێ هەنگاوێکی پێویست و پیرۆزە لە زیانی ڕۆشنبیریی گەلەکەمان و کاری گرنگی پاراستنی زمانەکەیدا(*) .

(*) ئەم وتارە لەو کۆڕەدا خوێندراوەتەوە کە بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی لە ٢٥و ٢٦و ٢٧ی تەمووزی سالی ١٩٧٣دا بۆ لێکۆلینەوەی کتێبی قوتابخانە بە زمانی کوردی بەستی . هەروەها لە ژمارە ( ٦ )ی سالی ١٩٧٣ی گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ( ل ٥٧-٨٢ )دا بلاوکراوەتەوە .

## (( ئەستێرەگەشـە ))

# لـەژێر هەوری هەڵـەو ناتەواویدا

دەمێکە دەست بە کاری فەرهەنگنووسیی کوردی کراوەو دانەری یەکەم فەرهەنگی کوردی کورد بووە . لە ساڵی ١٠٩٤ك ــ ١٦٨٢ / ١٦٨٣زدا شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانی لەژێر ناوی «نەوبەهار»دا فەرهەنگۆکێکی بە شیعر بۆ یارمەتیدانی منداڵانی کورد لە فێربوونی زمانی عەرەبیدا نووسیوە . دوابەدوای ئەم فەرهەنگە گەلێك فەرهەنگ لە زمانیکوردییەوە بۆ زمانێکی تر ، یاخود لە زمانی بێگانەوە بۆ کوردی دانراون . بەم جـۆرە تاکو ئێسـتا نزیکەی ( ٥٠ ) فەرهەنگو فەرهەنگۆکی کـوردی بڵاوکراوەتەوە . هەرچـەندە زوربەی ئـەو فەرهەنگانە ، لەبەر گەلێك هۆی ئاشکرا ، لەسەر شێوەو ڕێگایەکی زانستی دانەنراون ، لەگەڵ ئەوەشدا بە نیسبەت کاری فەرهەنگنووسیی کوردییەوە چەند هەنگاوێکی گـەورە نراوەو ژمارەیەك فەرهەنگی سەرکەوتوومان هەیە .

وەك ئاشـکرایە ، ماوەیەکـە کاری فەرهەنگنووسیی کوردی خەریکە جێگەی شایانی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیریو زانستی گـەلی کورددا دەگرێتو هەندێك مامۆستای دڵسۆز وەك : تۆفیق وەهبی ، قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، شێخ محەمەدی خاڵ ، گیو موکریانی ،

مەردۆخ ، عەلائەددین سەجادی ، چەرکەزی بەکۆ ( باکایێف )، جەمال نەبەز ، ئیڤان فاریزۆڤ ، سەمەندی سیابەند ، جگەرخوێن ... هتد لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوە . ئەم مامۆستایانە لە دەرگایەکی فراوانەوە چوونەتە ناو مێژووی ڕۆشنبیری کوردەوە ، بەوەی هەریەکەیان لە سنووری تواناى خۆیدا ئەوەی لە باریدا بووە بۆ پاراستنی زمانی نەتەوەکەی دلسۆزانە جێبەجێی کردووە . ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەتە کە ئەم کارە هەر بەردەوامەو بەرەی نوێی گەلەکەمان لەم مەیدانە سەختەدا خەریکە ، بەوێنە چەند مانگێك لەمەوبەر مامۆستا فاضل نظام‌الدین‌یش فەرهەنگێکی کوردی ــ عەرەبی لەژێر ناوی « ئەستێرەگەشە »دا بلاوکردەوە[1] .

× × ×

فەرهەنگی « ئەستێرەگەشە » بە پێشەکییەکی کورت بەناوی « وشەیەکی پێویست »ەوە دەستپێدەکات . لەم بەشەدا نووسەر کەمێك لە پێویستیو دەوری فەرهەنگ بەگشتیو چۆنیەتی دانانی فەرهەنگی « ئەستێرەگەشە »و سەرچاوەو نیشانەکان ... دواوە .

نووسەر لەم پێشەکییەدا هەرچەندە بە گیاتێکی لە خۆبوردووەوە کارەکەی بە تەواو دانانیو گومانی لە بوونی کەموکورتی نییە ، کەچی لە سەرێکیکەوە پەردەی بەسەر ڕاستییەکی ئاشکراو ڕوونو دیاردا داوە کە دەلێ : « تا ئێستە فەرهەنگێکی کوردی ــ عەرەبی بەم شێوەیە نەهاتۆتە بەر دەستو پێك نەهێنراوە » ( ل ٥ ) . هەموو دەزانین ، سالی ١٩٦١ مامۆستا گیو موکریانی فەرهەنگێکی کوردی ــ عەرەبی

(١) فاضل نظام الدین ، « ئەستێرەگەشە » ، فەرهەنگی کوردی ــ عەرەبی ، بغداد ٢ ١٩٧٧ .

بەناوی « فەرهەنگی مەهاباد »ەوە بلاوکردەوە[٢] . لام وایە چ لە بارەی زۆری وشەوەو چ لە ڕووی دانانو ڕێکخستنەوە ، «فەرهەنگی مەهاباد» لە فەرهەنگی « ئەستێرەگەشە » باشترەو کەمو کورتیو ناتەواوی کەمترەو تەنانەت دەتوانم ڕێگە بە خۆم بدەم کە بلێم گەلێك لایەنی ڕاستو زانستانە کە لە « فەرهەنگی مەهاباد »دا هەیە ، لە « ئەستێرەگەشە »دا شێوێنراوە . جا « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە » ، کە شازدە ساڵێك دوای « فەرهەنگی مەهاباد » کەوتبێ . جێگەی ڕەخنەیە بەو چەشنە بێت .

ئەگەر ئەو چەند وشەیەی سەرەوە نیشانی ئەوە نەدەن کە نووسەری « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە » پەردەی بەسەر ڕاستیدا دابێ ، ئەوە لە لاپەڕەی دواتری پێشەکییەکەدا تەواو خوێنەر دێتە سەر ئەو بڕوایە کە ویستراوە « فەرهەنگی مەهاباد » زیندەبەچاڵ بکرێ . ئەمەش لە باسی ئەو سەرچاوانەدا بەدی دەکرێ کە نووسەر سوودی لێ بینیون . لە لاپەڕە ( ٦ — ٧ )دا مامۆستا ناوی هەندێ کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامەو فەرهەنگی هێناوە ، بەڵام بە هیچ چەشنێك ناوی « فەرهەنگی مەهاباد »ی نەبردووە . جێی سەرسوڕمانە ، دانەری فەرهەنگێکی کوردی — عەرەبی ، سوود لە فەرهەنگی ئینگلیزی — عەرەبی ... وەربگرێو تەماشای « فەرهەنگی مەهاباد » نەکات کە وەك ئەوەی خۆی کوردی — عەرەبییەو لەوەی خۆشی سەرکەوتووترە !... یاخود سەیر ئەوەیە کە گوایا کەلکی لە « فەرهەنگی ڕابەر »[٣] وەرگرتووە

(٢) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی مەهاباد » ، فەرهەنگێکی قوتابخانەیی کوردی — عەرەبییە ، هەولێر ، ١٩٦١ .

(٣) گیو موکریانی ، « فەرهەنگی ڕابەر » ، فەرهەنگێکی قوتابخانەیی عەرەبی — کوردییە ، هەولێر ، ١٩٥٠ .

که عەرەبی ــ کوردییەو هەر بەرهەمی مامۆستا گیو موکریانییەو کەچی ناوی « فەرهەنگی مەهاباد » ، کە وەك « ئەستێرەگەشە » کوردی ــ عەرەبییە بەژێر لێــوەوە کردووە . بێگــومان ئەو کارە نەك هەر بۆ فەرهەنگنووسێك ، بەڵکو بۆ هەر مرۆڤێـــك جێگەی سەرزەنشتو لۆمەو گلەییە .

لە پێشەکیدا هەندێ ناڕاستیو کەموکورتی دیکە هەن ، بەڵام زۆر بە پێویستی نازانم لێرەدا لێیان بدوێمو خوێنەری ئازیزیان پێــوە ماندوو بکەم . بەڵکو باشترە بێینــە سەر لێکۆڵینەوە لــە کاکڵی فەرهەنگەکە .

× × ×

هەرچەندە لەم فەرهەنگەدا زوربەی ئەو وشانەی بەسەر زارەوەن دەبینرێن ، بەڵام لەگــەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر وشـــە هەن نەکەوتوونەتە ناو فەرهەنگەکەوە ، کە وەنەبێ کەمتر بەکار بهێنرێن وەك لە بەشێك لەو وشانەی کە کەوتوونەتە ناوەوە ، بەوێنە : ئابخانە ، ئاچغ ــ ئاچوغ ، ئاخوا ، ئازووقە ، ئاواتە ، ئاواتەچی ، ئۆف ... و گەلێکیتر لە ناو فەرهەنگەکەدا نەنووسراونو ئەوەش کە هێندێکیان بە ڕەسەن کوردی نین نابێت ببێتە کۆسپ لەبەردەمی ئەوەدا کــە نەخرێنە ناو فەرهەنگەکەوە ، چونکە زوربەیان لــە هەموو سووچێکی کوردســـتاندا زانراونو بوونەتە موڵکی کورد . هەروەها بۆ پتر سەلماندنی ئەم ڕایە لە فەرهەنگی ناوبراودا گەلێك وشـــەی بێگانە تۆمارکراوە .

بەداخەوە دانەر زۆر بایەخی بە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشـــە نەداوە ، هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە لــە فەرهەنگەکەدا لــەو کۆمەڵە وشانەی لە دروستبووندا پەیوەندییان لە نێواندا هەبە کەموکورتیو

ناتەواوی دەبینرێ . بە وێنــــە وشــــەی « ئابڕوو ، ئابڕووبردن ، ئابڕووچـــوون ، ئابڕوودار » هەیەو « ئابڕووبران ، ئابڕووبەرە ، ئابڕووتــکان ، ئابڕووتــکاو ... » نیـیــە . « ئابووری » دراوەو « ئابوور ــ بــە واتای حــەیا ، داوێن پاکی ، شــەرەف ، شانازی ، نامووس » نەدراوە . وشەی « ئاتەش ، ئاتەشخانە » تۆمار کراوە ، کەچی « ئاتەشبازی ، ئاتەشپەرست ، ئاتەشپەرستی ، ئاتەشـــخان ، ئاتەشکێش ، ئاتەشگا ، ئاتەشگەدە ، ئاتەشگەردان ... » نەنووسراوە . وشەی «ئاخر» دەبینرێ ، بەڵام «ئاخربوون ، ئاخرخێر ، ئاخرزەمان ، ئاخرشەڕ ، ئاخروئۆخر ، ئاخری ... » بەرچاو ناکەون . « ئاخون » نووسراوەو « ئاخوند » تۆمار نەکراوە . « ئاردەمشـــــار » هەیەو « ئاردەبرنج ، ئاردەوا ( چێشتی شلو تراو ) ... » نییە . « ئازاد ، ئازادبوون ، ئازادخوا ... » دراوەو « ئازادیخــوا ، ئازادیخــواز ، ئازادیخوازانە ... » نەدراوە . « ئاژەڵ » هەیە ، کەچی « ئاژەڵدار ، ئاژەڵداری ... » نییە . « ئاسان ، ئاسانکردن » تۆمار کراون ، بەڵام « ئاسانبوون » پەڕێنراوە . « ئاســوودە ، ئاســوودەیی » هەیەو « ئاســــوودەبوون ... » نییە ... و گــــەلێکی دیکە . لـــە چاوپیاخشاندنێکی سەرپێیدا دەتوانرێ بە سەدان لەو جۆرە نموونانە بهێنرێتەوە ، ئــەو هەموو نموونەیەی ســەرەوەش تەنیا لـــە چەند لاپەڕەیەکی کەمی سەرەتاوە وەرگیراون .

یاخود ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لە ڕیزی وشــە کوردییەکاندا گەلێك ڕستەو دەستەواژە ( شبە جملە ) تۆمار کراون ، وەك : « ئارەقی ڕەشو شین ڕشتن » ( ل ١٣ ) ، « بە ئاسمانا چوون » ( ل ١٥ ) ، « ئاسنی سارد کوتان » ، « ئاگر گەش کردنەوە » ( ل ١٩ ) ، « ئاوریشمی دەسکرد » ( ل ٢٣ ) ، « ئاو لە دنگدا کوتان » ( ل ٢٤ ) ، « ئاو بە ژێر کادا بردن » ( ل ٢٢ ) ، « ئەمەش داوا کراوەکـــەیە »

( ل ٣٢ ) . « بسته بالآی چل گەزه ڕیشه » ( ل ٥٤ ) ، « دەست بـه كلاوی خۆدا گرتن » ( ل ٣١٩ ) ، « ساله های سال » ( ل ٤٠٩ ) . « سابوون لەبەر پێدان » ( ل ٤٠٥ ) ، « ســـەره گوریس به دەس ەبوون » ( ل ٤٥٥ ) ، « شێر به گوێ گرتن » ( ل ٥٠٠ ) ... دەیان سوونەی تر . بێ‌گومان ئەو نموونانەی لەسەرەوە ناومان بردن وشه نین ، لەبەر ئەوە ڕاست نی‌یه له ڕیزی وشەدا تۆمار بكرێن ، وەك مامۆستا فاضل نظام‌الدین كردویەتی . بەلآم ڕاست وایه كه به نموونه بۆ ڕوون كردنەوەی وشـــه بەكار بهێنرێن . به ڕای من ئەمه ناتەواوی‌یەكی گەورەی فەرهەنگەكەیەو هەتا له فەرهەنگی « الهدیة الحمیدیة فی اللغة الكردیة »ی یوسف ضیا پاشای خالیدی كه نزیكەی ( ٨٥ ) سالێك لەمەوبەر[٤] ، و « فەرهەنگی مەهاباد »ی گیو موكریانی كـه شازده ساله ... له چاپ دراون ، ئەو جـــۆره كەم‌و كورتی‌یانه نابینرێن . یاخود له هیچ یەكێك لەو فەرهەنگانەدا ، كه سەرچاوەی كەلك‌و سود وەرگرتنی « ئەستێرەگەشه »ن ئەو هەلەیه تێ نەپەڕیوه ...

له فەرهەنگی ناوبراودا كۆمەلێك وشه دەبینرێن كه لـه حالەتی ڕێزمانیدان . بەوێنه « ئالۆزكاوتر » ( ل ١٩ ) . ئەم جۆره وشـــانه ڕاست نیه وەك وشـــەی فەرهەنگی تۆمار بكرێن ... جگه لـەوه نووسەر دەستكاری هەندی وشەی كردووەو تێكی‌داون . به نموونه ، له لاپەڕه ( ١٤ )دا « ئـازەبه »ی لەبری ( عـــازەبه ) تۆماركردووه . نووسەری فەرهەنگ دەبێ ئەوه تۆمار بكا كه میللەت دەیلێ ، نەك به ئارەزووی دلی خۆی بجوولێتەوه . ئاشكرایه ، كـورد « ئارەق »و « عارەق » دەلێ ، بەلآم « ئازەبه » نالێ‌و « عازەبه » دەلێ . دیـاره سەلیقەی كۆمەلی كورد ئەوەی بەلاوه پەسەندبووه . ئیتر ئێمه دەنگی

---

(٤) یوسف ضیاءالدین باشا الخالدی المقدسی ، الهدیة الحمیدیة فی اللغة الكردیة ، استانبول ، ١٣١٠هـ / ١٨٩٣م .

( ع )مان بەلاوە گونجاو بێ یان نا ، ئەوە ڕەوڕەوەی مێژوو ناگۆڕێ .

وەك وتمان ، گەلێك وشەی پێویستو گرنگو ئاشکرا هـەن نەکەوتوونەتە ناو فەرهەنگەکەوە ، کەچی ژمارەیەك ڕستەو دەستەواژە موعامەلەی وشەیان لەگەڵدا کراوە . سەرەڕای ئەوە ، نووسەر هەندێ زاراوەی وای تۆمار کردوە کـە لـەم ساڵانەی دوایـدا دانراونو داڕێژراونو بنجیان دانەکوتاوەو بەلای خەڵکیشەوە لەبار نین ، وەك : «کۆئەندام ــ جهاز» ، «دژەکردار ــ رد فعل» ، «بازنە لێکەوتەکە ــ دائرة التماس» ، « بازگە ــ ساحة اللعب » ، « ئاسنی داڕێژراو ــ حدید الصلب » ، « ئاسنی گونجاو ــ حدید المطاوع »[٥] ... زۆریتر . بەم بۆنەیەوە دەمەوێ سەرنجی مامۆستا بۆ ئەوە ڕابکێشم ، کە بە ڕای من باشتر وابوو چاوێك بەو زاراوە زانستیيانەدا بخشێنێتەوە کە تۆماری کردون ، چونکە بەشێکی زۆری نەك هەر ڕاسـت دانەڕێژراونو نەچەسپاون ، بەڵکو ئەوانەن کە هەر زوو ڕەت کراونەتەوە . ئەمانە دەمێك لە فەرهەنگی وەهادا تۆمار دەکرێن ، کە گومان لە بنجو ڕیشە داکوتانیان نەمابێ ، بەڵام پێویستە ئەوە لە بیر نەکەین کە بەشی زۆری ئەو زاراوانەی لەم ساڵانەی دوایيدا دانراونو مامۆستا ئاخنیونیە نێـو « فەرهەنگی ئەستێرەگەشـە »وە هێشتا هەر پێشـنیارن . نەدەبوو مامۆستا هێندە پەلەیان لێ بکا .

لە ڕیزکردنی وشە کوردیيەکاندا بە تەواوی لەسەر ئەو زنجیرەیەی بۆ ئەلفوبێی کوردی هەیەو کـە نووسەر خۆشی لـە پێشەکیدا

---

(٥) سەرەڕای ئەوە ، وشە هەیە کە لە ( ئاسن )ەوە داڕێژراوەو کورد لە دەمێ ساڵەوە بەکاری دێنێ ، کەچی نووسەر تۆماری نەکردووە ، بۆ نموونە : ( ئاسنەواڵە ــ تەلو بزمارو لەتوپەتی مەکینە شکاو ، هەر شتێکی تریش کە لە مەعدەن دروست کرابێو بێکەڵك بووبێ ) .

وەری گرتوە ، نەڕۆیشتووە . بە وێنە «ئاخوداخ»و «ئاخ هەلکێشان»ی خستۆتە پێش « ئاخافتن »و « ئاخاوتن » کە دەبوو دواتر بێن .. هتد .
هەندێ جار هەر یەك وشە لە چەند شوێنێك تۆمار کراوە ، بە نموونە دەبینین وشەی « ئاسایی » لە پێش « ئاسان ، ئاسانکردن ، ئاسانی ، ئاسایش »ەوە هاتووە ، کەچی دەبینین ــ لە دوای « ئاسایش »ەوە سەر لە نوێ هاتۆتەوە . بەلام وشەی هاوواتاو وێکچوو هەن ، هەر یەکەی لــە شوێنێ پێویستی خــۆی دانەناوە ، بەلکو لــە یەك دێڕدا ڕیزی کردوون ، بڕوانە « بەلکم ، بەلکــو ، بەلکە ، بەلکی » ( ل ٧٨ ) ، « پۆقــین ، دەرپۆقــین ، هەلپۆقــین » ( ل ١١١ ) ... هتد . ئەم کــەم و کورتیيانەش بوونەتە هــۆی شــێواندن و تێکەل و پێکەلی و زەحمەت کێشان لە دۆزینەوەی هەندێ وشەدا .

سەرەڕای ئەوانە ، هەلەی زۆرو بێ شوماری ئیمــلاو چاپ زۆر لاپەڕەی فەرهەنگەکــەیان گرتۆتەوەو پاشاگەردانییەکی تەواویــان ســاز کردوە .

بەم جۆرە ، تاکو ئێرە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە بەشە کوردییەکەی فەرهەنگی « ئەستێرەگەشە » پڕ کەم و کورتی و ناتەواوی و هەلــەیە . ئەویش بە زۆری تۆمار نەکردن و پەڕاندنی گەلێك وشەیەو بوونی هەندێ دەستەواژەو ، ڕستەو زاراوەی ناڵەبارو نەچەسپاوو ناڕاستی ڕیزکردنی وشەو نووسین و چاپ ... ن .

× × ×

وەك لە هەر زمانێکدا ، هەروەها لە زمانی کوردیشدا وشە هەیە کە بە خوێندنەوەو نووسین ، وەك یەکن ، بەلام مانایان جیاوازە ، وەك :

( ئاش )[١] دەزگایەکە گــەنم و دانەوێلەی تری پێ دەهاڕن و دەیکەن بە ئارد ، یا بۆ مەبەستێکی تر ورد ی دەکەن .

( ئاش )[٢] چێشت

( تیرە )[١] هۆز ، ئێـــل
( تیرە )[٢] تیرەی بن کلاش

( بـــیر )[١] بیرو هۆش
( بـــیر )[٢] بئر ــ عەرەبی

ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن ، لەو وشانە نین کـــە مانایان زۆرە ، بەڵکو ئەو وشانەن کە تەنها لـــە خوێندنەوەو نووسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتاو پەیدابووندا جیاوازن • جا ئەم جۆرە وشانە پێویستە لێك جیابکرێنەوەو تێکەڵ نەکرێنو لە فەرهەنگدا وەك ئەو شێوەیەی لە سـەرەوە نووسـراون تۆماربکرێن ــ واتە بە وشەی جیاوازو سەربەخۆی هاوبێژ ( مشترك لفظی ــ homonym ) دابنـــرێنو سەرلەنوێ لە سەری دێڕ ، وەك وشەیەکی تایبەتی بنووسرێنو ژمارەیان بۆ دابنرێت • نەوەك وەك نووسەری « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە » کە ئەم جۆرە وشانەی بە فارێزەیەك لێك جوداکردۆتەوە • بێگومان دەبوو مامۆستاش لەسەر ئەو شێوەیەی پەنجەمان بۆ ڕاکێشاوە بڕوات ، ئەویش ئەو ڕێگە ڕاستەیە کە گشت فەرهەنگ نووسانی وڵاتە پێشکەوتووەکانو هەندێك لە زانا کوردەکان ( تۆفیق وەهبیو قەناتی کوردو چەرکەزی بەکۆو تا ڕادەیەك گیو موکریانی ) لەسەری ڕۆیشتوون • گلەیی لـــە مامۆستا فاضل نظام‌الدین ناکرێ ئەگەر مەفهوومی وشەی هاوبێژ لـــە وشەی فرەواتا بۆ جیـــانەکردبێتەوە ، چونکە ئەم باسە لـــە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی لێکســـیکۆلۆژی زمانی کوردیدا هێشتا لـــە پلەی سەرەتادایە • بەڵام فەرهەنگ نووسێك هەستی بەوە نەکردبێ کە بۆچی بەشێـــك لەو فەرهەنگانەی ئەو کەڵکی لێ بینیون ، ئەو دوو جۆرە وشەیەیان لەیەکتر جیاکردۆتەوەو هەر جۆرێکیشیان لە ڕیزکردنو واتا لێکدانەوەیاندا موعامەلەی تایبەتییان لەگەڵ کردووە ... ! ئەوە بـــە کەموکورتییەکی دیارو بەرچاو دادەنرێ •

دانەری « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە » بۆ جیاکردنەوەی ماناکانی وشە فرەواتاکان (الكلمة ذات المعاني الكثيرة - polysemantic ) یش هەر فاریزەی داناوە ، بەڵام بۆ ئاسانکردنی بەکارهێنـانی فەرهەنگ و کێشانی سنوور لە نێوان ماناکانی یەك وشـەدا باشتر وایە ماناکان بە ژمارە لەیەك جیابکرێنەوە • ئەوانەی فەرهەنگ بەکاردەهێنن لـەم ڕێگەیەوە لە تێگەیشتنی مانای وشەدا تووشی هەڵەو زەحمەت نابن و دانەری فەرهەنگەکەش جگە لەوەی بەم کارە شێوازێکی زانستی بە فەرهەنگەکەی دەدات ، هەندێ کێشەی زانستی وشەش خاوەکاتەوە •

وشەی هاوواتا ( المرادف – synonym ) بەو وشانە دەڵێن کە یەك مانا دەبەخشن یاخود مانایان لێك نزیکە ، بەڵام لە خوێنـدنەوەو نووسیندا جیاوازن ، وەك : « لێڕ – دارستان – جەنگەڵ » ؛ « ئەڤین – ئەوین – عەشق – دلداری » ••• هتد • بۆ فەرهەنگی ناوبراو پێویست بە وەرگێڕان و لێکدانەوەو شەرحی هەموو ئەو وشانە ناکات ، بەڵکو باشترە مانای وشەی یەکەمیان – واتە بە گوێرەی زنجیرەی ئەلفوبێی کوردی – یاخـــود هەرە ناسراویـان بدرێ و لەبەردەم ئەوانی تردا بنووسرێ : بڕوانە فلان وشە • ئەگەر جیاوازییەکیش لە نێوان واتایاندا هەبێت دەستنیشانی بکات •

بۆ نموونە لە فەرهەنگی مامۆســتا تۆفیق وەهبیدا بەرانبەر بە وشـــەی « Pîyaz » نووسراوە « See Pîyaz » و بەرانبـــەر بە وشـــەی « Weten » نووسراوە « See Nîshtman » ، وە لە شوێنی خۆیدا « Pîwaz » و « Nîshtman » لێکدراونەتەوە • هەروەها لە « فەرهەنگی مەهاباد »ی مامۆستا گیو موکریانیدا لـــە بەردەم وشەی « مچوورك » نووسراوە « انظر كلمة مووچڕکە »و لــە بەردەم وشەی « مەرشە » – « انظر كلمە دەمەقاڵێ » ، وە بەجیا لــە شوێنیخۆیدا « مووچڕکە » و « دەمەقاڵێ » لێکدراونەتەوە •

بەداخەوە نووسەری « ئەستێرەگەشە » ئەو ڕێگەیەی ـ واتە ئەو ڕێگە ڕاستو لەبارو دیارو ئاسانەی ساڵەهای ساڵە فەرهەنگ‌نووسانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات ڕەچاویان کردووە ـ نەگرتووە ، بەڵکو ماناى تێکڕای وشەکانی لێکداوەتەوەو ئەمەش بووە بە هۆی درێژەپێدانو دووپاتکردنەوە ... بەوێنە بەرانبەر وشەی « ئاژاڵ » نووسیویە « ماشیە ، بهیمە ، حیوان » ، کەچی کە هاتۆتە سەر « ئاژەڵ »یش سەرلەنوێ ئەو وشانەی لە بەرانبەر داناون . هەروەها ، بڕوانە وشەکانی : « ساقۆ ـ پاڵتۆ ـ پاڵتاو ـ قاپووت » ، « ئاخافتن ـ ئاخاوتن » ، « ئاسمان ـ عاسمان » ، « هەفتا ـ حەفتا » ، « ئارمق ـ عارمق » ... و گەلێکی‌تر . جگە لەوە لە زۆر شوێندا وشەی هاوواتای لەتەك یەك داناوەو ئەمەش بووە بە هۆی تێکدانی شێوەی ڕیزکردنی وشەکانو بە زەحمەت دۆزینەوەی وشە . بەنموونە ، بڕوانە : « زڕباب ـ زڕباوك » ، « شەممە ، شەمو ، شەمە » ... هتد .

چۆنیەتی ڕێکخستنو جیاکردنەوەی وشەی هاوێژ ( Homonym ) و فرەواتا ( Polysemantic ) و هاوواتا ( Synonym ) لە فەرهەنگدا کارێکی وردەو سەلیقەی دەوێت . ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەیە لە گەلێك فەرهەنگی کوردیدا ، بەتایبەتی لە فەرهەنگی ( تۆفیق وەهبیو فەناتی کوردۆو چەرکەزی بەکۆ ... )دا لەم ڕووەوە وردەکاری کراوە ، بەڵام بەداخەوە « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە »ی مامۆستا فاضل نظام‌الدین لەم بارەیەوە کەموکورتیو ناتەواوی ئێجگار زۆرەو هەندێکیان لە سەرەوە خستە بەرچاو . وا دەردەکەوێ کە مامۆستا نەك تەنها سوودی لە تەجروبەی فەرهەنگ‌نووسانی وڵاتە پێشکەوتووەکان ، بەڵکو لە هی کوردیش وەرنەگرتووە . بە ڕای من ئەگەر مامۆستای بەڕێز فاضل نظام‌الدین سوودی لە شێوازی داناو ڕێکخستنی ئەو فەرهەنگانەی ناومان بردنو

ئەو تێبینیانەی کاتی خۆی خستمانە پێش چاوی وەربگرتایە ، ئەوە تەنیا ڕادەی فەرهەنگەکەی پێ بەرز دەبووەوە .

یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی فەرهەنگی کوردی ـ بێگانە ڕوونکردنەوەی مانای وشەیە . جگە لەوە نیشاندانی چۆنیەتی بەکارهێنانی وشەش شتێکی پێویستە لە کاری فەرهەنگنووسیدا . لەبەر ئەوە پێویستە بەشێکی زۆری وشەکان بخرێنە ناو ڕستەی کورتو ئاسانەوە ، تاوەکو مانای وشەکان باشتر ئاشکرا بن‌و تا خوێنەر لەو ڕێگایەوە بزانێ چۆن ئەو وشانە لە ڕستەدا بەکار دەهێنرێن . جگە لەوە دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە تێوانی وشەی زمانێك لەگەڵ زمانێکی تردا تەنها ئەوە نییە ، کە بەرانبەر یەکن‌و هاوواتان ، بەڵکو پەیوەندیی ئاڵۆزو جیاواز هەیە لە شێوەی بەکارهێنانیاندا . بۆ نموونە لە « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە »ی مامۆستا فاضل نظام‌الدین‌دا دەبینین بەرانبەر وشەی « مەخز » نووسراوە «اصل» ( بڕوانە : ل ٦٨١ ) . لەبەر ئەوەی لە زمانی عەرەبیدا وشەی « اصل » چەند مانایەکی جیاوازی هەیە ( بڕوانە : المنجد ، ل ١٢ ) بۆ خوێنەر مانای تەواوی « مەخز » ئاشکرا نەبوو . بەڵام ئەگەر وتەکە بخرایەتە ناو ڕستەیەکی کورتی ئاسانەوە ، ئەوە مانای باشتر ڕووندەبووەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە ، کە ئەمە بۆ گشت وشەیەك نییە ، بەڵکو زۆر وشە هەن کە ئاسانن‌و زۆر بەسەر زاری مرۆڤەوەن ، یاخود لێکدانەوەی مانایان ئاسانەو بێ ڕستەش ئاشکران . ئەوەی لەم ڕووەوە پەیوەندی بە « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە »وە هەبێت ، ئەوەیە کە هیچ وشەیەك نەخراوەتە ڕستەوەو نموونەی بۆ نەهێنراوەتەوە . ئەمەش کەم‌و کورتییەکی گەورەو بنەڕەتییەو پێویستی بە چارەسەرکردن دەکرد .

لە هەندێ شوێندا مانای وشە باش لێك نەدراوەتەوە ، بەوێنە دەبینین بەرانبەر بە « قەلەمرداری » ( ل ٥٤٣ ) نووسراوە ( اسم لعبە ) .

بێ گومان لە کوردەواریدا یاری جۆری زۆرەو هەر یارییەکیش ناوی تایبەتی خۆی هەیە . جا لێرەدا ئەگەر ڕوون نەکرێتەوە ، خوێنەر چووزانێ ئەو یارییە چییەو چۆنە . لەم جۆرە شوێنانەدا - واتە لە کاتێکدا کە لە زمانی عەرەبیدا وشەیەکی هاوواتا نەبێت بۆ دانی مانای وشەیەکی کوردی ، ئەوە شەرح دەتوانێ دەوری ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی مانا ببینێت .

لە مەسەلەی لێکدانەوەی مانای وشە کوردییەکاندا لە گەلێ شوێندا ئەوە بەرچاو دەکەوێ کە بەرانبەریان وشەی عەرەبی وا دانراون کە بە هیچ چەشنێك هاوواتایان نین . نیشاندانی ئەو جۆرە هەڵانەش ، ئەگەر بۆمان کرا ؛ بە وتارێکی سەربەخۆ پێشکەشی دەکەین .

لە ئەنجامدا دەمەوێ سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشم ، ئەو چەند کەموکورتییەی لە فەرهەنگەکەدا هەن پێویستیان بە دوورخستنەوە هەیە ... ئەگەر ئێمەش لە چەند شوێنێکدا بیروڕامان لەگەڵ دانەری بەڕێزدا جیاواز بێتو ناتەواوییەکانی فەرهەنگەکەیمان دەرخستبێ ، ئەوە مەبەستمان ئەوە نییە کە لە نرخی مامۆستاو کارەکەی کەم بکەینەوە . بەڵکو بڕوامان بەوە هەیە کە ڕەخنەی زانستی مایەی پێشخستنو گەشەکردنە . بۆیە داوا لە مامۆستای بەڕێز دەکەم ئەو سەرنجانەم بە دڵێکی فراوان وەربگرێ .

بێ گومان ئەم کارە گرانە کە مامۆستا ئەرکو شەونخوونی زۆری لەگەڵ کێشاوە . کەڵکو سوودی هەیەو دەوری خۆی دەبینێ . بەڵام ئەدەبوو هێندە - دەو پڕ کەموکورتیو ناتەواویو هەڵە بێت ، بەتایبەتی بۆ فەرهەنگێك کە لەم سەردەمەدا بڵاوکرابێتەوە . واتە دوای ئەوەی کاری فەرهەنگنووسیی کوردی خەریکی گرتنی جێگەی شایانی خۆی بێ لە ژیانی ڕۆشنبیریو زانستی گەلی کورددا و ژمارەیەك فەرهەنگی

نایابو بەنرخو سەرکەوتوو بلاوکرابنەوە • بێگومان چاوەڕوانی ئەوە دەکرێ ڕۆژ بە ڕۆژ کاری فەرهەنگنووسیی کوردی بەرەو پێشەوە بڕواتو هەنگاوی گەورە بهاوێژێ • بەڵێ کاری فەرهەنگنووسیمان لە برەوایە ، بەڵگەی ئەم دیاردەیەش ژمارەیەك لەو فەرهەنگانەن کە لە ماوەی ئەم بیست ساڵەی دواییدا هەندێ مامۆستای دڵسۆز بلاویان کردۆتەوە • شۆڕشی گەورەی ئەم مەیدانەش وا لە تەقینەوەدایە ــ ئەویش ئەو فەرهەنگە نایابە بێهاوتایەی مامۆستا زەبیحییە کە ئێستا لەژێر چاپدایە[٦] • بەڵام بەداخەوە « فەرهەنگی ئەستێرەگەشە » لە ناومرۆکدا کەتەفتو لێڵوکزە(*) •



(٦) ئەو فەرهەنگە کوردی ــ کوردییەی مامۆستا زەبیحی کە لەسەر ئەرکی خۆی خستوویەتییە ژێر چاپو بەرگی یەکەمی لە تەواوبووندایە . ئەم کارە خزمەتێکی گەورەی زمانی کوردی دەکاو گەلێك کێشەی ئالۆزی فەرهەنگنووسیی خاودەکاتەوە .

(*) بڕوانە : ڕۆژنامەی « بیری نوێ » ، ژمارە ٤٤٧و ٤٤٨ی ساڵی ١٩٧٧ .

# کارێکی گەورە لـە باسی ئیدیۆم

# لـە زمانی کوردیو لـە فەرهەنگنووسیی کوردیدا

لێکۆڵینەوەی ئیدیۆمی زمانی کوردی باسێکی نوێیەو تاکو ئێستا شتێکی ئەوتۆی دەربارە نەنووسراوە . لە نێو ئەو کارانەی لەم کێشەیە دواون ، کتێبی ( مەکسیمی خەمۆ )[1]و وتارێکی ( یو . یو . ئاڤالیانی )[2] کە بە زمانی ڕووسی نووسراون ، بەتایبەتی ... دیارن .

جگە لەو چەند لێکۆڵینەوەیە ، هەروەها مامۆستایان : تۆفیق وەهبیو قەناتی کوردۆو چەرکەزی بەکۆ .... لـە فەرهەنگەکانیاندا هەندێ ئیدیۆمیان تۆمارکردووە . مامۆستا صادق بەهائەددین ئامێدیش لە ساڵی ۱۹۷۳دا لە بەغدا کتێبێکی گـەورەی بەناوی « ئیدیەمێت کوردی »یەوە بڵاوکردەوە[3] . بەداخەوە ئەم نووسراوە کە بریتییە لە فەرهەنگێکی ئیدیۆمی کوردی ـ عەرەبی گەلێ وشەی ئاساییو فرێزی

---

(۱) د . مەکسیمی خەمۆ ، دەربارەی فرێزیۆلۆژیی ناو لە زمانی کوردیدا ، یەریڤان ، ۱۹۷۱ ( بە زمانی ڕووسی ) .

(۲) یو . یو . ئاڤالیانی ، مەسەلەی جیاکردنەوەی کرداری لێکدراوو ئیدیۆمی کردار ( لەسەر کەرەستەی زمانی کوردی ) ، « کورتەی هەواڵەکانی کۆنفرانسی زمانناسی » ، سەمەرقەند ، ۱۹۵۸ ، ل ۰٤۰-۳٤ ( بە زمانی ڕووسی ) .

(۳) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ئیدیەمێت کوردی ، بەغدا ۱۹۷۳ .

بەرەڵڵای تێدا تۆمارکراوە کە بە ئیدیۆم دانراونو زوربەی ئیدیۆمەکان مانایان باش لێك نەدراوەتەوە • بێ گـــومان هۆی ئەو کەموکورتیو ئاڵۆزییەش نەبوون یـــا کەمیی لێکـــۆڵینەوەی تیۆریی ئیـــدیۆمە • لێکۆڵینـــەوەی قووڵو تەواو لـــە ئیدیۆمی زمانی کـــوردی مەودای ساغ کردنەوەی گەلێك کێشـەی گرنگو ئاڵۆزی وشەو دەســـتەواژەو ڕستە ئاسان دەکاو زەمینەی ڕێکخستنی فەرهەنگ تەخت دەکا •••

ڕستە کە لە ئاخاوتنی ئێمە پێکهاتووە ، بەسەر وشـــەدا دابەش دەبێ • کەم ڕێ دەکەوێ ڕستە لە یەك وشە دروست بووبێ • پتر لـــە پێکهاتنی ڕستەدا چەند وشەیەك بەشداری دەکەن : ( ئازاد چوو بۆ بازاڕ ) ، ( ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژی هاوینـــــە ) ••• لە ڕووی سینتاکس ( Syntax ) ەوە ڕستە یەکسەر بەسەر وشەدا دابەش نابێ ، بەڵکو لە نێوان ڕستەو وشەدا زنجیرێکی سینتاکس هەیە ـ ئەویش فرێز ( عبارە ـ Phrase )ە ••

فرێز بەو دانە سادە سینتاکسییە دەڵێن ، کە لە دوو یاخود چەند وشەیەکی سەربەخۆ[٤] پێکهاتبێو ڕێزمان بەیەکەوەی بەستبێ •

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر فرێز هەیە :

١ ـ فرێزی بەرەڵڵا •

٢ ـ فرێزی گیراو •

فرێزی بەرەڵڵا ئەوەیە ، کە بە ئاسانیو بەپێی پێویست دابڕێژرێ ،

---

(٤) بێ گومان پێویـــستە لە چەند وشـەیەکی سـەربەخۆ ( واتە لـــە چەند وشـەیەکی تەواو ) پێکهاتبێ . لەبەر ئەوەی ( پیتی بانگێشتنو پیتی پێوەندی ... ) وشـەی ناتەواونو ناتوانن فرێز دروستبکەن . بەوێنە لە ڕستـەی « من دەچم بۆ بازاڕ »دا ناتوانین بڵێین ، کـــە « بۆ بازاڕ » فرێزە . چونکە ( بۆ ) وشـەی تەواو نییە .

یاخود له ڕسته دەربهێنرێ . به وێنه له ڕستەی « تۆ دیمەنی بەهارو جەژنی نەورۆزت دیوە ؟ »دا دەتوانرێ دوو فرێزی بەرەڵلاّ : « دیمەنی بەهار » ، « جەژنی نەورۆز » وەربگیرێ .

هەرچی فرێزی گیراوە پێی دەوترێ « ئیدیۆم ، فرێزیۆلۆژی » . کاتێ له یەکگرتنی هەندێ وشەدا واتای تایبەتی پەیدا دەبێ ، ئەوە بەو جۆرە فرێزانه دەڵێن ئیدیۆم .

له زمانی کوردیدا ــ وەك هەر زمانێکی دیکەی سەر ئەم زەمینه ــ جگه له وشەی جیاجیا ، که دانەی زمانن ، هەروەها پێکهاتنی ئاڵۆزیش هەیه که پێی دەوترێ ئیدیۆم ، وەك : « برین کولانەوە » ؛ « شـــوول لێ هەلبڕین » ؛ « کای کۆن بەباکردن » ؛ « کلك و گـــوێ کردن » ؛ « ناوی به گەرووی ئاشا چێ » ؛ « زمان لێ دەرهێنان » ؛ « کەولەکۆن » ؛ « لووت تێ ژەندن » ؛ « دایه کێو » ؛ « دەســـتی داری گرتووە » ؛ « مل له چەقۆ سوین » ؛ « دووکەڵ له ماڵی هەڵناسێ » ... هتد .

لەبەر ئەوەی که ئیدیۆم له سیستێمی زماندا به مانای دیکه دێت ، پێویسته له ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنی خاسیەت و دەوریدا ، لـــه لایەکەوە له فرێزی بەرەڵلاّو له لایەکی ترەوە له وشەی جیاجیـــا ، جیابکرێتەوە .

ئەو دوو ڕێگەیەی لێکۆلینەوەی ئیدیۆم ، وەك دیاردەیەکـــی دیاریکراوی زمان شتێکی زۆر پێویست و گرنگه ، ئەویش لەبەر دوو هۆ : یەك ــ ئیدیۆم له زماندا ئەرکی خۆی له ڕێگای وشەی جیاجیاوە دەبینێ ، دوو ــ ئیدیۆم له پێکهاتنیدا لێکدراوەو پارچەکانی وشـــەی سەربەخۆن . تەنیا له تەماشاکردنی تەواوو وردبوونەوەیَ قوول لـــه خاسیەت ، جیاوازی لەگەڵ فرێزی بەرەڵلاّدا دەردەکەوێ و له وشـــه

نزیك دەبێتەوەو لە دوایدا ، واتە لە ئەنجامی بەراوردکردنیدا لەگەڵ وشە : دەتوانرێ بزانرێ ئیدیۆم چییە .

لێکۆلینەوە لە کێشەی ئیدیۆمی زمانی کوردی ، نەك تەنیا کەلك وسوودی بۆ دامەزراندنی تیۆریی ئیدیۆمی زمانی کوردی هەیە بەتایبەتی ، بەلکو هەروەها بۆ کاری فەرهەنگنووسیی و لێکسیکۆلۆژیش بەگشتی گەلێك پێویستو بەکەلکە .

خاسیەتی سەرەکیی ئیدیۆم ــ واتە فرێزی گیراو ــ ئەوەیە کە بە شێوەیەکی بنەرەتی لە فرێزی بەرەڵلا جیایەو لە هەمان کاتدا لە وشە نزیك دەبێتەوە . فرێزی بەرەڵلا لە کاتی ئاخاوتندا دروست دەبێ ، هەرچی ئیدیۆمە لە کاتی ئاخاوتندا دروست نابێ ، بەلکو دانەی تەواوو ئامادەی زمانە . بەوێنە لە کاتی ئاخاوتندا کە دەوترێ : « کامەران هێندەی ڕست ، سەرم ئاوسا » : ئەوە لەم ڕستەیەدا « سەرم ئاوسا » کە ئیدیۆم ( فرێزی گیراو )ە ، وەنەبێ لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا دروست بووبێ ، بەلکو لە شێوەیەکی ئامادەو پێکەلدا لە زماندا هەبووەو بەر لەم کاتە دارێژراوە . پێویست بە بیری خاوەنی ڕستەکەیدا هێناوەتەوەو ئەویش وەك کەرەستەیەکی ئامادە هەستی خۆی پێدەربڕیوە ... هەرچی فرێزی بەرەڵلایە لە کاتی ئاخاوتندا لە وشەی جیا دادەڕێژرێ . بە نموونە کە دەوترێ : « منیش پاش چەند ساڵێك تووشی لاوێکی ڕووناکبیر هاتم » ، ئەوە لەم ڕستەیەدا « لاوێکی ڕووناکبیر » ، کە فرێزی بەرەڵلایە لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا لە وشەی جیا دروست بووە .

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش : بۆچی کێشەی فرێزی گیراو لە بەشی لێکسیکۆلۆژیدا تەماشا دەکرێت ؟ ... ئاشکرابە ، کە فرێز بارچەیەکە لە ڕستە ــ واتە مەفهوومی سینتاکسییەو ئەمە ڕاستەو بەم

پێیە دەبێ لە بەشی سینتاکسدا لێی بکۆڵرێتەوە ، بەڵام کێشەی فرێزی گیراو ( ئیدیۆم ) لە سنووری سینتاکس دەردەچێو لە ایێکسیکۆلۆژی نزیك دەبێتەوە • زۆر جار دەبینین کە بە ماناو واتا وەك یەك وشەیە ، بەوێنە ئیدیۆمی : « ئەسپێ لە گیرفانیدا سەوزەڵە گیانم دەڵێ » ، بە ماناو واتای وشەی « لات ، هەژار » دێت • یاخود فرێزی گیراوی : « نانی لەسەر ساج سووتاوە » ، بەرانبەر بە وشەی « پەلەکەر » دەوەستێ •

لە زمانی کوردیدا فرێز هەن ، کە هەمیشە بەرەڵـلان ، وەك : « کچی جوان » ؛ « پیاوی ئازا » ؛ « نامە نووسین » ؛ «چاخواردنەوە» « کتێب خوێندنەوە » •• هتد • فرێزیش هەن کە هەردەم گیراون ؛ وەك : « گوڵوڵەی کەوتۆتە لێژی » ؛ « لووت تێژەندن » ؛ « دایە کێو » ؛ « یاری بە ئاگر کردن » ••• هتد •

هەروەها زۆر فرێزیش هەن ، کە دەکرێ بەرەڵلاش و گیراویش بن • ئەمەش پێوەندی بە ماناو مەبەست و بەکارهێنانیانەوە هەبەو لە رستەدا دەردەکەوێ • بەوێنە فرێزی : « شووڵی لێ هەڵبڕی » ــ مانـــا ڕاستەوخۆکەی ئەوە دەگەیەنێ کە «یەکێك شووڵ لە یەکێك هەڵبڕێ» • بەم پێیە ، ئەمە فرێزێکی بەرەڵلایە • بەڵام بە مانای تیانی ــ واتە « لە تامی دەرکرد ، لـە ڕادەی تێپەڕاند » ــ دەبێ بە فرێزێکی گـیراو ( ئیدیۆم )• یاخود فرێزی « دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکـــا » ــ مانــ ڕاستەوخۆکەی ئەوە نیشاندەدا ، کە « یەکێك دۆ بەێـ دۆشاودا تێکەڵی بکا » ئەمە فرێزێکی بەرەڵلایە • هەر ی ئەم فرێزەیە بۆ ئەوە دەوترێ ، کە « یەکێك لە وتووێژێـ ـد لە کارێکدا •• تووڕە دەبێو قسەی نابەجێ دەکاو لە ڕادەی ـەڕێنێ» ــ بەم مانایە فرێزێکی گیراو دروست دەبێ • فرێزی «ئاشی ناگەڕێ» ، ئەگەر وەك فرێزێکی بەرەڵلا بەکاربهێنرێ ، ئەوە واتاکـەی ئـــەوە

دەردەخا کە « ئاشەکەی ئیش ناکات » ، بەڵام کە بێ بە فرێزێکی گیراو ( ئیدیۆم ) ، ئەوە مانای « کاری وەستاو » دەگەیەنێ ـ واتـە مەرج نییە ـ ئەو کارە ئیشی ئاش بێت ، بەڵکو هەر ئیشێك بێ جیاوازی نییە •

فرێزی گیراو ( ئیدیۆم ) هەموو وەك یەك نین ، بەڵکو لە ڕادەی یەكگرتن‌و پێوەندی ئەو وشانەی پێکی دەهێنن‌و لە ڕووی ئەوەوە کە مانای گشتی فرێزەکە تا چ ڕادەیەك بە هەر وشەیەکی ئـــەو فرێزەوە پەیوەستە ، جیاوازی هەیە • جا لەم ڕێگەیەوە لە زمانـی کوردیـدا دەتوانرێ چەند جۆرێك ئیدیۆم دیاری بکرێ[٥] •

لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ئیدیۆم هەیە ، بۆیە لە زانین‌و فێربوون‌و وەرگێڕانیدا بۆ سەر زمانێکی‌دی ، گیروگرفت دێتە پێش ، جا بۆ ئاسانکردنی ئەو کارە ، پێویست بـە لێکۆڵینـەوە لـە جۆرەکانی ئیدیۆم‌و ڕێکخستنی فەرهەنگی ئیدیۆم هەیـــە •

زمانەوانانی ئەمڕۆی یەکێتی سۆڤیێت گرنگی‌یەکی زۆریان بـــە کێشەی ئیدیۆم داوە ، بەڵگەی ئاشکراش ئەوەیە کە گەلێ کــاری تیۆری دەربارەی ئیدیۆمی زمانی نەتەوە جۆربەجۆرەکانی ئەو وڵاتە بڵاوکراوەتەوەو ژمارەیەك فەرهەنگی ئیدیۆم چاپ کراوە • ئەمەش بەگشتی لـە گەشەپێدان‌و پێشخستنی کاری فەرهەنگ‌نووســیدا دەورێکی گەورەی بینیوە ••• تیشکی ئەو پێشکەوتنە وا تـــەواو زمانی کوردیشی ڕووناك کردەوە • ئەوەتە لاوی زاناو کوردپەروەر د•

---

(٥) بۆ زانستی زیاتر لەبارەی ئیدیۆمەوە ، بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل ٥٦ـ٦٨ .

مەکسیمی خەمۆ[٦] ، کە بەڕاستی شاسواری ئـەو مەیدانەیە ، پاش هەوڵو تەقەلای بێوچانی پتر لە دە ساڵ توانی فەرهەنگێکی گەورەی زانستی ئیدیۆمی کوردی ـ ڕووسی لـە چاپدا[٧]و لـەم مەیدانەدا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنێ •

ئەم فەرهەنگە (٢٨٤) لاپەڕەی قەوارە گەورەیەو نزیکەی هەشت هەزار ئیدیۆمی کوردی تێدایە ، کە ماناکانیـان بـە ڕووسـی لێکدراوەتەوە • لە (٢٨) لاپەڕەی سەرەتادا دەربارەی ئیدیۆمی زمانی کوردی کۆلیوەتەوەو لە چەند سەرێکەوە ، بەر لە هەمووش لە ڕووی پێکهاتنو ئەرکەوە گەلێ زانیاریی نویی خستۆتە پێشچاو ••• دواتر لە چۆنێتیی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی ئیدیۆم بۆ ئەو فەرهەنگە دواوە • باسی شێوەی ڕێزکردنو جیاکردنەوەیانی کردووە ••• لە لێکدانەوەی مانایانو شێوەی جۆربەجۆری وەرگێڕانیانی کۆلیوەتەوە ••• هتد •

ئەم فەرهەنگە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو ئیدیۆمانەی گرتۆتە خۆی کە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ( بەتایبەتی ) لە بەشە دیالێکتی یەکێتی سۆڤێت )دا دەبینرێن • هەروەها بەشێك لەو ئیدیۆمانەش کـە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا بەکاردێن ، لەم فەرهەنگەدا تۆمـار کراون •

---

(٦) د. مەکسیمی خەمۆ لـە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی یەریڤان کاردەکاو لە بەشی کوردیی زانستگەی یەریڤان دەرسی زمانی کـوردی دەڵێتەوە ، ئەم زانایە لەبارەی زمانی کوردییەوە چەند وتـارو نامیلکەی بلاوکردۆتەوە ، وەك : « ڕەخنە لە کتێبەکەی ج . خ . باکایێڤ ( شێوەی کوردی تورکمەنستان ) » ، گۆڤاری « مێژوور فیلۆلۆژی » ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ، ژ ٣ ؛ « مۆرفۆلۆژیی شـێوەی بادینان » ( کـورتەی نامەی دوکتۆری ) ، یەریڤان ، ١٩٦٥ ؛ « دەربارەی فرێزیۆلۆژیی ناو لە زمانی کوردیدا » ، یەریڤان ، ١٩٧١ ... و هەندێکیتر .

(٧) د. مەکسیمی خەمۆ ، فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی ـ ڕووسی ، یەریڤان ، ١٩٧٩ .

وەك ئاشكرایە زوربەی ئیدیۆمی كوردی هێشتا هەر لە ئەخاوتن و فۆلكلۆردا دەبینرێن و سەدانیان لە نووسیندا بەكارنەهێنراون . بەشی زۆری ئەو ئیدیۆمانەش كە كەوتوونەتە نووسینەوە ئەوانەن كـە لـە ئەخاوتندا زۆر چالاكن ، سەرەڕای ئەوەش فرەواتاكانیان بۆ هەمـوو واتاكان بەكارنەهێنراون .. جا بۆیە دە. خەمۆ لە دانانی ئەم فەرهەنگەدا ئەدەبیاتی كوردی نەكردۆتە سـەرچارەی سەرەكـیو لـە زاری حیكایەتخوان و دیهاتیی كوردەوە كەرەستەی بۆ فەرهەنگەكـەی كۆكردۆتەوە . ڕاستە لەم قۆناغەدا فەرهەنگی ناوبراو ناتوانێ دەورێكی گەورە لە ئاسانكردنی تێگەیشتنی تێكستی ئەدەبیدا ببینێ ( هەرچەندە مەبەستی فەرهەنگەكەش تەنیا هەر ئەوەندە نییە ) ، بەڵام دوارۆژ ـ واتە كاتێك ئیدیۆمەكانی زمانی كوردی ئەدەب دەڕازێننەوە ، ئـەوە دەتوانێ باش ئەو نیشانە بپێكێ .. نووسەر لە سەرێكی دیشەوە ئەو سامانەی نەتەوەكەمانی لە مەترسیی تیاچوون ڕزگاركردووە .. ئـەم بەرهەمە جگە لەو كەڵكە زۆرەی بۆ زمانەوانان و قوتابیان و ئـەدەب دۆستان و وەرگێڕان هەیەتی ، هەروەها ڕابەرێكی كەم هاوتاشە بـۆ نووسـەران .

لە نێو فرێزو ڕستەی هەمەچەشنەی كوردیدا ، بەر لە هەمـوو شـتێك پەندی پێشینان و قسەی نەستەق سـەرنجڕادەكێشن و كۆكردنەوەو لێكۆڵینەوەو لە چاپدانیان[8] گەلێك پێش خڕكردنەوەو تۆژینەوەی ئیدیۆم كەوتووە .. نەك هەر لە لێكۆڵینەوەی زمانـی كوردیدا ، بەڵكو لە لێكۆڵینەوەی زمانـە پێشكەوتووەكانیشـدا جیاكردنەوەی ئیدیۆم لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق كێشەی زۆر

(٨) تۆماركردنی پەندی پێشـینان و قسەی نەسـتەقی كوردی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی هەژدە . هەندێ لەو دەستنووسانە لە ماتێندەرانی یەریڤان و كتێبخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی لێنینگـراد پارێزراون .

لەسەرە • شایانی باسە دە مەکسیمی خەمۆ زانایانە بۆ ئەو باسە چووەو سنووری ڕاستو لەباری لە تێوانیاندا کێشاوە •

دە خەمو لە چۆنێتیی وەرگێڕانو لێکدانەوەی مانای ئیدیۆمەکانی فەرهەنگەکەیدا لەهەمان کاتدا هونەرێکی بەرزی نواندووەو بە زمانێکی ڕەوانو ئاسان ، بە وشەو فرێزو ڕستەی پڕ بە پێستی خۆی شەرحـــی ئیدیۆمەکانی کردووەو مانایانی لێکداوەتەوەو هەر ئیدیۆمێك چەنـــد مانای هەبێت ، هەموو ماناکانی بە ڕووسی نووسیوە ، هەروەها ئەگـــەر ئیدیۆمێکی کوردی لـــە ڕووسیدا بەرانبەری هەبێت ، ئەوە ئیدیۆمە ڕووسی‌یەکەشی هێناوەتەوە •

ئەم فەرهەنگە لە ڕووی زۆری ئیدیۆمو شێوەو شێوازو جۆری دانانو ڕیزکردنو ڕێکخستنی ئیدیۆمەکانو لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەو بەکالآکردنەوەی مانای ئیدیۆمەکاندا کارێکی گەورەو زانستیو بەنرخو نایابەو کەلێنێکی گەورەی لە کاری تیۆریی ئیدیۆمو فەرهەنگنووسیی کوردیدا پڕکردۆتەوە • هەرچەندە چەند ناتەواویو کەموکورتی‌یەکـــی کەم لە « فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی ــ ڕووسی »دا هەیە[9] ، بـــەڵام ئەو ناتەواوییانە بە جۆرێك نین لە نرخی ئەو کارە شاکارە کەم بکاتەوە•

لە کۆتاییدا هیوامە خامەی ڕەنگینی دە مەکسیمی خەمـــۆ لـــە مەیدانی بەرینی فەرهەنگنووسیی کوردیدا هەر لە برەودا بێ(*) •

---

(٩) لە کەموکورتیی ئەو فەرهەنگە نەدواین ، چـــونکە بە زۆری مەبەستی ئەم وتارەمان ڕاگەیاندنی دەرچوونی کاری ناوبراوە .

**(*) ئەم بەرهەمە بە هەڵە دوو جار بلاوکراوەتەوە :**

**یەك ــ گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٦٣ ، حوزەیرانی ١٩٨٠ ، ل ٢ــ٦**
**دوو ــ گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٤ ، شوباتو ئاداری ١٩٨١ ، ل ١ــ٤ •**

## هەوڵێکی مەزنی نوێ
## لـــە جیهانی فەرهەنگنووسیی کوردیدا

موفرەداتی زمانی کـــوردی قاڵبۆوەی ســـاڵانی دوورو درێژی مێژووی گەلی کوردەو سۆرەو تۆرەیچەندین پلەو قۆناخی هەڵس و کەوتی باری ژیانو هاتو نەهاتیتی . لەو ماوە درێژو بەرفراوانەدا کە بە سروشـــت لەکەودراونو گێژەکراونو گورگـــەو بنژبلەو زنیوانیـــان لێ گیراوە . لە زۆر ڕووی گرنگەوە پتەو بووەو بەخـــۆدا هاتۆتەوەو دەولەمەند بووە .

دەمێکە دەست بە کاری تۆمارکردنی وشەی کوردی کراوەو وەك ئاشـــکرایە ، ماوەیەکـــە کاری فەرهـــەنگنووسیی کـــوردی خەریکە جێگەی شایانی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیریو زانستی گـــەلی کورددا دەگرێتو هەندێك مامۆستای دڵسۆز لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوە . ئەو مامۆستایانە لە دەرگایەکی فرارانەوە چوونەتە ناو مێژووی ڕۆشنبیری کوردەوە بەوەی هەر یەکەیان لـــە سنووری توانستی خۆیدا ئەوەی لەباریدا بووە بۆ پاراســـتنی زمانی نەتەوەکەی دڵسۆزانە جێبەجێی کردووە . ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەتە کە ئەم کارە هەر بەردەوامەو بەرەی نوێ گەلەکمان لەگەڵ مامۆستا قاڵبووەکانماندا لەم مەیدانە سەختەدا خەریکن . بەوێنە چەند مانگێك

لەمەوبەر د. زارێ یوسف‌و د. قەناتی کوردۆ فەرهەنگێکی کوردی ( دیالێکتی کرمانجیی خواروو ) — ڕووسی‌یان بڵاوکردەوە[1] .

کوردناسانی یەکێتی سۆڤێت گرنگی‌یەکی زۆریان بە نووسینی فەرهەنگی کوردی داوە . بەڵگەی ئاشکراش ئەوەیە ، کە تا ئێستا گەلێك فەرهەنگیان چاپکردووە[2] . ئەمەش بە گشتی لە گەشەپێدان‌و پێشخستنی زمانی کوردی‌و کاری فەرهەنگ‌نووسیدا دەورێکی گەورەو دیاری بینیوە .

د. قەناتی کوردۆی شاسواری ئەم مەیدانە ، کە لە نووسینی فەرهەنگی کوردی ( دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ) — ڕووسی بووەوە[3] ، بیری دانانی فەرهەنگێکی کوردی ( دیالێکتی کرمانجیی خواروو ) — ڕووسی هەراسانی کردو پاش ماوەیەك لەگەڵ د. زارێ یوسف دەستیان دایە ئەو کارە مەزنەو چەند مانگێك لەمەوبەر ئەم فەرهەنگە کە بەرهەمی ڕەنجی چەند ساڵەیان بوو لە چاپ دراو سەرکەوتنێکی گەورە لە کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا بەدەست هێنرا .

ئەم فەرهەنگە ( ٧٥٢ ) لاپەڕەیەو نزیکەی ( ٢٥ ) هەزار وشەی کوردی تێدایە ، کە ماناکانیان بە ڕووسی لێکدراوەتەوە .

---

(١) د. قەناتی کوردوو د. زارێ یوسف ، فەرهەنگی کوردی — ڕووسی ( سۆرانی ) ، مۆسکۆ ١٩٨٣ .

(٢) بۆ وەرگرتنی زانیاری لە بارەی ئەو فەرهەنگانەوە ، بڕوانە : د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل ٩١ — ٩٦ .

(٣) د. قەناتی کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی — ڕووسی ( کرمانجیی ژووروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ .

د. قەناتی کوردۆ پێشەکی بۆ ئەم فەرهەنگە نووسیوەو لەبارەی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشـــە کوردییەکانو سازکردنی بەشـــە ڕووسییەکەیو چۆنیەتی ڕێکخستنو دانـانی فەرهەنگەکەوەو ... ( ل ٥ـ٨ ) تێیـــدا دواوە . ئەم پێشەکییە لـە لایەن د. جەمشـــید حەیدەرییەوە کراوە بەکوردیو لە ( ل ٩ـ١٥ )دا چاپکراوە . وای بە باش دەزانم لە سەرەتادا لە ڕێی ئەو پێشەکییەوە فەرهەنگی ناوبراو بە خوێنەر بناسێنمو دوایی بیروڕای خۆم بخەمە پێشچاو .

## « پێشـــەکی

ئەم فەرهەنگە ، یەکەم فەرهەنگی کوردی ڕووسییە ، کە لێکسیکی زمانی ئەدەبیی هاوچەرخی کوردی عێراقی ، لەسەر بناغەی لێکسیکی زاراوی ( دیالێـــکتی ) خـــوارووی زمانی کـــوردی ـ « سۆرانی » تێدا تۆمارکراوە .

زمانی ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە دوو فۆرمی جیاوازی هەبووە ـ زاراوی خواروو ( باشوور )و زاراوی ژووروو ( باکوور ) ـ و شان بە شانی یەك ئەم دوو زاراوە لە پێشکەوتندان .

کوردەکانی کوردستانی عێراق ( ناوچەی ســلێمانی ، هەولێر ، ڕەواندووز ، کۆیسنجاقو کەرکوك ) بە زاراوی سۆرانی دەدوێن ، هەروەها کوردەکانی کوردستانی ئێران ( ناوچەی مەهاباد ، شنۆ ، بانەو سەندووج ) هەمان زاراویان هەیە . کوردەکانی کوردستانی تورکیاو سوریاو هەندێ ناوچەی کوردســـتانی عێراقیش ، وەك : ئامێـــدی ، ئاکرێ ، دهۆكو چیاکانی ژەنگار بە زاراوی کرمانجی ژووروو دەدوێن ، هەروەها کوردەکانی ژووروی ڕۆژئاوای ئێران لـە شاری خۆیەوە تاکو کەناری گۆلی وەرمێو ناوچەکانی بوجنوردو کۆچان ( خۆراسان ) ئاخاوتنی پێدەکەن . جگە لەمانیش کوردەکانی یەکیـەتی سۆفیەت

( ناوچەکانی پشت قەوقاس‌و ئاسیای ناوەڕاست ) بەم زاراوە دەدوێن •

لـە لێکسیک‌و فۆنەتیک ، بنیـاتی ڕێزمانیـدا هەردوو زاراوی ژووروو‌و خواروو جیاوازییان هەیە ، بەتایبەتی دەبێ پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین . کە ڕاناوی کورتکراو ( ــ م ، ــ ت ، ـی (ئی) ، ــ مان ، ــ تان ، یان ) ، لە سۆرانیدا بەپێچەوانەی کرمانجی ژوورووەوە لـە بەکارهێنانی کارو گەردانکردنیدا وەزیفەیێکی فراوانیان هەیە ، لە سۆرانیدا هەست بەوە دەکرێت ، کـە فلێکسی نـێو بەرەو بزربوون دەچێت • هەرچەندە لە ناوچەکانی سۆرانی وەك ( هەولێرو ڕەواندوزو مەهاباد )دا جیاوازی نێوان نێرو مێ بە نیوەچڵی یاخود بە تەواوی هەر ماوە بەڵام لە ناوچەی سلێمانیدا بە تەواوی وونبووە • لە هەمان کاتدا لە کرمانجی ژووروودا جیاوازی کەتیگۆری ناوی نێرو مێ هەر ماوەو بە تەواوی بوونی خۆی پاراستووە ــ وە یا لە فۆرمی ئینزافەت‌و فۆرمی ( کازوس ئۆبلیکوس )ی چەماوەدا بەڕووتی دەردەکەوێ • فۆنەتیکی سۆرانی ئەم ڕووخسارە تایبەتییانەی هەیە :

١ ــ لێوەکی ( لیوو لێو ) ( و ــ $W$ ) لەباتی ( ڤ ــ $V$ )ی کرمانجی •

٢ ــ لە سۆرانیدا (ڵ)و (ل) هەن ، لە کرمانجیدا تەنها (ل) هەیە •

٣ ــ مەسەلەی فۆنێم تاکو ئێستا دەربارەی دەنگەکانی $K$ ، $T$ ، $P$ و $K'$ ، $T'$ ، $P'$ ( پ ، ت ، ك ) ڕوون نەکراوەتەوە •

٤ ــ جۆری نەرمبوونی دەنگەکانی ( ك ، گ ) لەبەر دەنگە بزوێنەکانی ڕیزی پێشەوە لە هەندێ لە گوفتارەکاندا ڕەچاو دەکرێت •• هتد •
هەروەها لە نووسیندا جیاوازی لە نێوان ئەم دوو زاراوەدا هەیە • ئەدەبیـاتی زاراوی کرمانجی ژووروو بەزۆری بە پیتی لاتینی چاپدەکرێت ، جگە لـە کوردەکانی وولاتی‌سۆڤیەت ، کـــە

بەرهەمەکانیان بە پیتی ڕووسی چاپدەکەن ، بەڵام ئەدەبیاتی زاراوی کرمانجی خنوارو بەپیتی عەرەبی چاپدەکرێت و دەنووسرێت و دەستکارییەکی وەهای ئەلفوبێی عەرەبییەکە کراوە ، کە لەگەڵ زمانی کوردیدا بگونجێت •

لە مێژووی وشەنووسینی کوردیدا فەرهەنگی وەرگێڕاوو لێکدراوی کوردی هەیە ، کە لێکسیکی زمانی کوردی بە هەردوو زاراویەوە شوێنی خۆیان تێدا کردۆتەوە •

مێژووی دانان و چاپکردنی فەرهەنگ بە زاراوی کرمانجی لە پێشەکییەکەی فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ق• کوردۆدا نووسراوە[٤] و بەتایبەتیش لە نامەی دوکتۆرای ئاورەحمانی حاجی مارفدا ، کە ئەسپراتورەی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی لێنینگراد تەواوکردووە ، بەگشتی نووسراوە[٥] •

ئەو فەرهەنگانەی ، کە بەتایبەتی لێکسیکی زاراوی سۆرانییان تێدا تۆمارکراوە ، ئەمانەن : فەرهەنگی خاڵ بە هەرسێ بەشەکەیەوە[٦] ، کە لەتەک وشەکانی ئاخاوتنی سۆرانیدا ووشەی گۆڤەرەکانی ( زاراوەکانی )تریشی تێدا تۆمارکراوە ( مەبەست لەو وشانەیە ، کە لە گۆڤەرێکی ترەوە هاتوونەتە نێو سۆرانیو ، لە فەرهەنگدا شوێنی خۆیان گرتووە ، دانەر نیشانەی چاوگەکەیان دەکات ) • فەرهەنگی خاڵ زۆر دەوڵەمەندە لەبارەی مەتریالی جۆرجۆری لێکسیکی هەمەڕەنگەوە،

---

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٥ ـ ١٤ ( بە ڕووسی ) ، ل ١٥ ـ ٢٤ ( بە کوردی ) •

(٥) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردی و شێوازی دانانی فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ، لێنینگراد ، ١٩٧٣ ، ل ١٦ ـ ٩٩ ( نامەی دوکتۆری ، بە زمانی ڕووسی ) •

هەروەهاش نرخی تایبەتی ئەم فەرهەنگە لەوەدایە ، کە جۆری نووسین‌و فۆنەتیکی تێدا ڕەچاوکراوە ) •

فەرهەنگی کوردی ــ عەرەبی گیوی موکریانی[٧] لێکسیکی ووشەکانی ناوچەی سۆران‌و بادینان دەگرێتەوە • ژمارەیێکی زۆری ووشەی تێدا تۆمارکراوە ، بەلاّم فرازیەلۆژی تێدا دەست‌نیشان نەکراوە ، بێجگە لە فرازیۆلۆژی ڕێزمانی نەبێت • ئەم فەرهەنگە بە یەکێ لە فەرهەنگەکانی وەرگێڕاوی کوردی دەژمێردرێت •

کۆلکەزێڕینە ــ فەرهەنگی ( کوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ــ فەرەنسی ــ ئینگلیزی ) بابەتییە ، گیوی موکریانی داینـاوەو پاشکۆیێکی فەرهەنگۆکی کوردی ــ ئینگلیزی ئاخاوتن لەگەلدا بلاّوکراوەتەوە[٨] •

لێکسیکی سۆرانی لەگەل کورتە باسێکی ڕێزمانی ، لە فەرهەنگەکەی عەلائەدین سەجادی‌دا ، کە بە زمانی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی دانراوە هەیە[٩] • ئەمانە ئەو فەرهەنگە بابەتیان بوون ، کە لێکسیکی زاراوی سۆرانیان تێدا تۆمارکراوەو ئەم بابەتە لێکسیکانە دەگرنەوە : ووشەی ناومال ، ناوی نەخۆشی ، بەشەکانی لەش ، کات‌و شوێن ••• هتد • هەر بەشێك لەم بەشانە بە نموونەی بەکارهێنانی ووشەکانەوە کۆتایی دێت •

---

(٦) شێخ محەمەدی خال ، فەرهەنگی خال ، سلێمانی ، ب ١ ، ١٩٦٠ ، ب ٢ ، ١٩٦٤ ، ب ٣ ، ١٩٧٦ •

(٧) گیو موکریانی ، « مەهاباد » ، فەرهەنگێکی قوتابخانەیی کوردی‌و عەرەبییە ، هەولێر ، ١٩٦١ •

(٨) گیو موکریانی ، « کۆلکەزێڕینە » ، کوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ــ فەرەنسی ــ ئینگلیزی ، هەولێر ، چاپی یەکەم ، ١٩٥٥ ، چاپی دووەم ، ١٩٦٦ •

(٩) عەلائەدین سەجادی ، دەستوور وە فەرهەنگی زمانی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی ، بەغدا ، ١٩٦٢ •

فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی تۆفیق وەهبی و ك. ئەدمۆندس[10] بریتییە لە ووشەکانی زمانی ئەدەبیی ئێستای کوردی عێراق ، بە پیتی لاتینی چاپکراوە . لەم فەرهەنگەدا دانەران دەستنیشانی ئەو ووشانە دەکەن ، کە لە زمانێکی بێگانەوە کەوتوونەتە نێو زمانی کوردی ، وەك فارسی ، عەرەبی : تورکی . ئەم فەرهەنگە بەپێچەوانەی ئەوانەی لە سەرەوە ناومان بردوون ، لایەنی رێزمانیشی تێدا تۆمارکراوە ، ووشە ئەگەرێنێتەوە سەر بەشەکانی ئاخاوتن ، کاری تێپەرو تێنەپەڕ دەست نیشان ئەکات . ئەمەش نرخێکی تایبەتی هەیە لەبارەی پێشاندانی فۆرمی گەردانو بناغەی « کار » ( فێل )ەکانی ( ئێستا )وە ، فەرهەنگی ناوبراو پاشکۆیێکی تایبەتی لەگەڵدایە ، ئەوە پیشان دەدات کە کوردەکان چ جۆرە سالنامەیەکیان بەکارهێناوە ، لیستەی ناوی کوردی ، ناوی هەندێك شارو نموونەی گەردانی کار .

بێ گومان ئەم فەرهەنگە لە رووی زانیارییەوە زۆر بەرخە ، بەلام لە بەکارهێنانەدا نەختێك گرانە ، چونکە ووشە کوردییەکان تەنیا بە پیتی لاتینی نووسراونو بەراوردەکەی بە عەرەبی نەنوسراوە ، جگە لەوەی فەرهەنگەکە بە پرینتسیپی هێلانەیی دانراوە ( مەبەست لەم پرینتسیپە ئەوەیە کە ووتارەکانی فەرهەنگ رەگی « کار » یاخود ووشە ئەکاتە بناغە ، واتە هەموو ووشەکانی ، کە نە رەگدا یێکنو یەك چاوگەیان هەیە ، یەك لە دووای یەك دەنووسرێن . ئەم پرینتسیپە دۆزینەوەی ووشەگران دەکات ) .

فەرهەنگە « کشتو کاڵ »ەکەی مەعرووف قەرەداغی

(10) Taufiq Wahdy and C. J. Edmonds, A Kurdish - English dictionary, London, 1966.

مەردووخی[11] کە بە یارمەتی کۆڕی زانیاری کوردی چاپکراوە ، وەك فەرهەنگێکی تێرمنەلۆژی نرخێـــکی تایبـــەتی هەیە • ئەم فەرهەنگە ژمارەیەکی زۆری لێکسیکی کشتوکالی تێـــدا تۆمار کراوە • لەوانە ( ناوی کەلوپەل ، ئامرازی کارکردن ، بەرهەمەکانی کشتو کاڵو تفاقی ئاومالّ ، ئاژەڵ ، دارو درەختی کوردستان ) • فەرهەنگەکە ئەوە پیشان ئەدا ، کە ووشەکان سەر بە چ ناوچەیەکن‌و لەکوێ بەکار دێن‌و هەروەها سەر بە چ گۆڤەریکی زاراوی ترن • ئـــەم فەرهەنگە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ لێکۆلینەوەی جۆری ژیان‌و کولتوری گوندیەکان •

ئەم سالآنەی دواییدا ، لیژنەی فەرهەنگ‌و زمانی کۆڕی زانیاری کورد لـــە عێراق ، هەولێکی باشی داوە بۆ دانانی تێرمنەلۆژی سیاسی ( رامیاری ) ، کۆمەلآیەتی ، زانیاری‌و ئیداری‌و هەمەجۆری • تاکـــو ئێستا کۆڕ توانیویەتی ئەم بەشانە ئامادەو چاپ بکات‌و بلآویان بکاتەوە •

لە سالی ١٩٧٧ بە یارمەتی کۆڕی زانیـــاری کورد جزمی یەکەمی قاموسی کـــوردی ــ کـــوردی ، عبدالرحمن محمـــــد أمین زەبیحی دەرچووە[12] ، بڕیار وایە بە دە جزم هەموو قاموسەکە چاپ بکرێت • ئەم فەرهەنگە لێکسیکی هەردوو زاراوە سەرەکی‌یەکەی زمانی کوردی دەگرێتەوە • دانەر لە فەرهەنگەکەیدا ووشەی هەر لە فۆلکلۆرەوە تـــا بەرهەمی نووسەرو شاعیران‌و تەنانەت ووشەی ناو فەرهەنگەکانی تریشی بەکار هێناوە • ئەگەر بەشەکانی تری ئـــەم فەرهەنگە چاپ بکـــرێن ، بێگومان ئەم فەرهەنگە بەشدارییەکی گەورە لـــە لێکۆلینەوەی زمانی کوردی‌دا دەکات‌و کەلێنێکی گەورەی کتێبخانەی کوردی پڕ دەکاتەوە •

---

(١١) مەعرووف قەرەداغی ، فەرهەنگی کشتو کال ، ب ١ ــ ٢ ، بەغـــدا ، ١٩٧٢ ــ ١٩٧٣ •

(١٢) عەبدولرەحمـــان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قاموسی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٧ •

ئەم فەرهەنگەی ئێمە ، لێکسیکی زاراوی کرمانجی خوارووی زمانی کـوردی ( سۆرانی ) بەتایبـەتی ئاخاوتنی گۆڤەری سـلێمانی دەگرێتەوە • شایانی باسە ، ئەم گۆڤەرە ئێستا پەلی هاوێشتووەو وەك سوونەی زمانی ئەدەبی کوردی لە سنووری کوردستانی عێراقدا خۆی چەسپاندووە • لـە کوردستانی عێراقدا ، ئێمـستا سـۆرانی زمانی خوێندن‌و نووسینی شێوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو بەرهەمە زانستییەکانە • لە سەرەتای سالآنی بیستەوە چاپو چاپەمەنی لـە کوردستانی عێراقدا سەری هەلداوە • دیوانی شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەهەم‌و بیستەم ، وەك نالی‌و سالم‌و کوردی‌و حاجی قادری کۆیی هاتوونەتە چاپکردن • هەر لەو سەردەمەشەوە ئەدەبی نوێی کوردی چاوی هەلهێناوەو نەش‌ونمای کردووە • شاعیری بەرزو چیرۆکنووسی گەورە لە ئەدەبی کـوردیدا سەریان هەلداوە • شاعیرانی وەك پیرەمێردو سەلام‌و زێوەرو بێکەس‌و گوران‌و هەژار ، چیرۆك نووسـانی وەك ئیبراهیم ئەحمەدو محەرەم محەمەد ئەمین‌و هتد • هەر لەو ساتانەشەوە ڕۆژنامە نووسیتی پەرەی سەندووەو زانایانی کورد بە سەدان بەرهەمی خۆیان دەربارەی مێژووو کولتووری میللەتی کورد ، کتێبی قوتابخانە ، فەرهەنگەکانی کوردی‌و مەتریالی فۆلکلۆری بلآوکردۆتەوەو چاپکردووە •

لەبەر نەبوونی فەرهەنگێکی کـوردی ــ ڕووسی ، خوێنـەری ڕووسی زمان لەم هەموو بەرهەمانە بێبەشن • جگە لەمەش پەیوەندی ئابووری‌و کولتووری نێوان وولآتی ئێمەو کۆماری عێراق کەوتە بارو دۆخێکی پێشکەوتووەوە ، لەبەر ئەمەش چاپکردنی ئـەم فەرهەنگە جگە لە لایەنە زانستییەکەی ، لایەنێکی پراکتیکیشی هەبەو شـتێکی پێویستی ئەم قۆناغەی پەیوەندی ئێمەو ولآتی عێراقە • ئەم فەرهەنگە ئەبێتە سەرچاوەیەکی یارمەتیدانی ئەوکوردانەی کـە ئەیانەوی فێری زمانی ڕووسی بین •

ئەمە یەکەم فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی یە لــە ولاتی ئێمــەو هەندەران ، کە بە لێکسیکی زاراوەی سۆرانی داندرابێت • ئــەم فەرهەنگە نێزیکەی ٢٥ هەزار ووشەی زمانی ئەدەبی کوردی تێــدا تۆمار کراوە ، قەوارەی فرەوانی فەرهەنگ لەوەدایە ، کە هەموو جۆرە لێکسیکی گرتۆتەوە ، لە هونەری‌و زانیاری‌و رامیاری‌و کۆمەلایەتی‌و ناومالّ تا دەگاتە ووشەکانی بەرهەم‌و بەهەم‌هێنان ، بەلکو جاری وەهاش هەیە ووشەی وای تێدایە ، کە خاسی‌یەتی چینێکی یا کۆمەلّ دەردەخات وەکو چینی جوتیاران یاخود کۆچەران • جگە لەوەی ووشەی خەلکی شاریشی تێــدا تۆمارکراوە • ئەم لێکســیکانە مێژووی کولتوورو خوو ڕەوشــتــو ژیانی کورد پیشــان دەداتو فەرهەنگ دەولەمەند دەکات • .

ئەم فەرهەنگە بە جۆرێکی گشتی ووشەی ئەدەبیانی کلاسیکی زاراوی خوارووی کوردی تێـــدا تۆمارکراوەو ووشەی ئاخاوتنی ناوبازاڕیشی گرتۆتە خۆی • سەرباری ئەوەی ووشــــەی زاراوی دراوسێش لــە فەرهەنگەکەدا هەن ، چونکە زۆر زەحمەتە لــە نێوان خۆیی‌و دراوسێی لە ووشەدا سنوورێکی تەواو بۆ ئەو گەڤەرانە دابنێین• هەروەها کۆمەلێ لەو ووشانەش ، کــــە لــە زمانەکانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواوە کەوتوونەتە نــاو زمانی کوردی ، یاخــود ووشــەی تازە دروست‌کراون ، لەم فەرهەنگەدا جێی خۆیانیان کردۆتەوە •

فەرهەنگەکەمان جۆری فۆنەتیکو نووسینی ووشەی ســادە ، ووشــــەی لێکدراوو پێکەوە بەستراو لە واتەو بنیــــاتی ڕێزمانی‌دا بشان‌دەداتو دەری دەخات • .

ووشەکانی کوردی بە پیتی عەرەبی نووسراون ، بەلام لە کەوانەدا بە پیتی لاتینی وێنەیان کێشراوە بە ( ترانسکریپسی ) بەو جۆرەی کە

( بەدرخان ) داینا‌وەو لە ڕاستیشدا باشترین ڕێنووسێکە کــە لەگەڵ فۆنێم‌و ووشەی کوردیدا بگونجێ‌و یارمەتییەکی باشی ئەو کەسانە دەدا کە دەتوانن فەرهەنگەکە بەکاربهێنن‌و بەلاّم پیتی عەرەبی نازانن ، چونکە لــە فەرهەنگەکــەدا جەدوەلی پیتی لاتینی‌و عەرەبی بەرامبــەر یەك نووسراون •

هەروەها لەم فەرهەنگەدا چەند لێکسیکی تریش هەیە ، کە تیایاندا جۆری گەردانی فێڵ ( کار ) پیشان دراوەو چەند زانیارییەکی ڕێزمانیش پێشکەشی خوێنەران کراوە ، لەهەمان کاتدا لیستەی کارە سادەکانی ڕەگی خراوەتە پاڵ فەرهەنگەکە •

دانەران بەم جــۆرەی خوارەوە پیتەکانیــان ئامادە کردووە :
ق• کوردۆ وشەکانی ئەم پیتانەی ئامادە کردووە : ( ئا ، ب ، پ ، ت ، ح ، د ، ع ، م ، هـ ، ئــە ) هەروەهــا مارف خەزنەدار سێ پیتی ( ق ، غ ، ج )ی ئامادەکردووەو ق• کوردۆ وەری گێڕاون بۆ ڕووسی‌و بەم جۆرەی ئێستا بۆ فەرهەنگەکە ئامادەی کردوون • زاریێ یووسف ووشەکانی ئەم پیتانەی خوارەوەی ئامادە کردووە : چ ، خ ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ف ، ڤ ، ك ، گ ، ل ، و ، ئو ، ئۆ ، ی ، ئی ، ئێ •

دانەران لە کاتی خەریك بوونیاندا بە دانانی ئــەم فەرهەنگەوە پرس‌و ڕاوێژیان لــە کوردەکانی عێــراق کردووەو مارف خەزنەدارو جەمشــید حەیدەری ( هەولێر ) ، کاوس قەفتــان‌و کــەمال مەزهەرو ئاوڕەحمانی حاجی مارف ( سلێمانی )و کەریمی ئەیووبی ( مەهەباد ) ــ کوردستانی ئێران ــو کەسانی‌تر یارمەتی‌یان داون •

ڕەنگە ئــەم فەرهەنگە بــەم جۆرەی ئێستا وەکـــو یەکەمین تاقی‌کردنەوە ، بێ کەم‌و کوڕی نەبێت ، بەلاّم سەرەتای ئەنجــامدانی کارێکی زانیاری گەورەو پراکتیکی‌یە لەبەردەم کوردناساندا‌و ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات •

دانەران هیوادارن کە ئەم فەرهەنگە ببێتە یاریدەدەرێکی بەکەڵك بۆ ئەوانەی لــە زمانو ئەدەبی کوردەکانی عێراقو ئێران دەکۆڵنەوەو دەخوێنن ؛ هەروەها سوودبەخشیشە بۆ ئەو کوردانەی کە دێنە وڵاتی سۆڤیەتو زمانی ڕووسی دەخوێنن •

**ق • کوردۆ**

**جەمشید حەیدەری لە ڕووسییەوە کردوویەتی بە کوردی» •**

× × ×

لە سەرەتای نووسینی هەموو فەرهەنگێکدا کێشەی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە دێتە پێشەوە • بنچینەی هەڵبژاردنی وشە پێوەندە بە جۆرو بابەتو مەبەستی فەرهەنگەوە • تاکو ئێستا کێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ لە هیچ وڵاتێکی جیهاندا شێوازێکی زانستیی تەواوی وەرنەگرتووەو هەندێ ڕووی ئەم مەسەلەیە هەر بە ئاڵۆزی ماوەتەوەو هەروەك زانای گەورەو فەرهەنگنووسی ناسراوو بەناوبانگی ڕووس ئەکادیمی ل• ڤ• شێربا دەڵێ : « کێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ بەکێکە لــە کێشە هەرە زەحمەتەکانی فەرهەنگنووسین »[13] ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین کە لــە تیۆریی فەرهەنگ نووسیدا هەنگاوی گەورە نراوەو گەلێك کاری ئاڵۆز خاوکراوەتەوەو ڕێنمایەکی وەها دانراوە کە فەرهەنگنووسەکان پەیڕەوی بکەنو لە ڕێگەیەوە لەگەلێك کۆسپ ڕزگاریان بێت • هەروەها دانانی ژمارەیەکی زۆر لە فەرهەنگ ــ واتە لە ئەنجامی هەوڵو کۆششو زانینو ئەزموونی فەرهەنگنووسەکاندا سەرمەشقێ هاتۆتە کایەوە •

---

(13) ل• ڤ• شێربا ، تیۆریی فەرهەنگنووسی ، مۆســـــکۆ ، ١٩٤٠ ؛ ل ١٠٦ ( بە زمانی ڕووسی ) •

هەرچەندە مەسەلەی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە کارێکی گرانە ، بەڵام ئەو ڕێنما تیۆری‌و پراکتیکی‌یەی کە تا ئەمڕۆ هاتۆتە کایەوە ، ئەم کارەمان بۆ ئاسان دەکات •

شایانی باسە ، دانەرانی فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی لە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشەدا کەلکیان لە ڕێبازی تیۆری‌و پراکتیك وەرگرتووەو لەم ڕووەوە بەپێی ئەو مەبەستەی لە پێشەکیدا بۆ دانانی فەرهەنگەکە دیاری‌یان کردووە ، بەگشتی سەرکەوتوون •

ئەگەرچی دە کورتۆو دە زارێ زۆر بایەخیان بە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە داوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم لایەنەوە لە فەرهەنگەکەدا هەندێ کەم‌وکورتی دەبینرێ • بە وێنە :

ڕاستە لەم فەرهەنگەدا زوربەی ئەو وشانەی لە ئەدەبیات‌و ئاخاوتنی دیالێکتی خوارووی کوردیدا بەکاردێن ، دەبینرێن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر وشە هەن نەکەوتوونەتە ناو فەرهەنگەکەوە ، کە وەنەبێ کەمتر بەکاربهێنرێن ، وەك لە بەشێك لەو وشانەی کە کەوتوونەتە ناوەوە • بۆ نموونە : ئانجانە ، ئاواتە ، ئاچغ ــ ئاچوغ ، ئۆف ••• هەندێکی‌تر لەناو فەرهەنگەکەدا نەنووسراون‌و ئەوەش کە هێندێکیان بە ڕەسەن کودی نین نابێت ببێتە کۆسپ لەبەردەمی ئەوەدا کە نەخرێنە ناو فەرهەنگەکەوە ، چونکە زوربەیان لە هەموو سووچێکی کوردستاندا زانراون‌و بوونەتە مولکی کورد • هەروەها بۆ پتر سەلماندنی ئەم ڕایە ، لە فەرهەنگی ناوبراودا گەلێك وشەی بێگانە تۆمارکراوە •

لەو کۆمەڵە وشانەی لە دروست بووندا پێوەندیان لە نێواندا هەیە ناتەواوی دەبینرێ : بۆ نموونە وشەی « ئابڕوو ، ئابڕووبردن ، ئابڕووچوون ، ئابڕووڕژان ، ئابڕووچوو ، ئابڕوودار ، ئابڕوومەند »

هەیەو کەچی « ئابڕووبراو ، ئابڕووبەرە ، ئابڕووتکاو ، ئابڕوونکاو ... » نییە . وشەی « ئابووری » دراوەو « ئابوور » بە واتای « حەیا ، داوێن پاکی ، شەرەف ، شانازی ، ناموس » نەدراوە . وشەی « ئاتەش ، ئاتەشپەرست ، ئاتەشخانە . ئاتەشك ، ئاتەشگا ، ئاتەشی » تۆمارکراوە . بەلام « ئاتەشبازی ، ئاتەشپەرستی ، ئاتەشخان ، ئاتەشکێش ، ئاتەشگەدە ، ئاتەشگەردان ... » نەنووسراوە . وشەی « ئاخر ، ئاخری ، ئاخرەمین ، ئاخرین » دەبینرێ ، کەچی « ئاخربوون ، ئاخرخێر ، ئاخرزەمان ، ئاخرشەو ... » بەرچاو ناکەون . « ئاردەمشار ، ئاردەوا » هەیەو « ئاردەبرنج ... » نییە . « ئاژەلدار » نووسراوەو « ئاژەلداری » تۆمارنەکراوە ... هتد .

ئەمە سەربارەت بە هەلبژاردنی وشە کوردییەکانی فەرهەنگی ناوبراو ، ئێستاش با ئاورێك لە چۆنێتی سازکردنی بەشە ڕووسییەکەی بدەینەوە :

وەك ئاشکرایە ، لە تیوان وەرگێڕانو تیۆری نووسینی فەرهەنگێك کە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکیتر بێت پێوەندی بەهێز هەیەو بنچینەی وەرگێڕانیش بایەخێکی تەواوی هەیە لە دانانی ئەو جۆرە فەرهەنگانەدا ، هەروەها ئەو فەرهەنگانەش لە کاری وەرگێڕاندا کەلکێکی زۆریان هەیە[14] .

هەرچەندە لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی تیۆری هیچ نووسراوێکی وەهامان نییە کە شایانی باس بێت ، بەلام لەگەل ئەوەشدا هەندێ شت لە ڕووسییەوە بۆ کوردی ، یاخود لە کوردییەوە بۆ ڕووسی وەرگێڕاونو لەم ڕووەوە تەجروبەیەکی بچووك هەیە . ئەمەو هەروەها

---

(١٤) ئا . ف . فیۆدوروف ، تیۆریی وەرگێران ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ل ٥ ـ ٦ ( بە زمانی ڕووسی ) .

سوود وەرگرتن لە تیۆری وەرگێڕانی ڕووسی ڕێگەیان بۆ دە کودۆو دە زاریّ ئاسانکردووە لـە نیشانکردنی جـۆری وەرگێڕانی وشـە کوردییەکانی فەرهەنگەکەیان بۆ سەر زمانی ڕووسی •

بێ‌گومان لە نووسینی فەرهەنگێکی وەهـادا ، بۆ وەرگێڕانو لێکدانەوەی وشـــە کوردییەکان بەتایبـــەتی وەرگێڕانی مطلــق « abso lute »و جـــزئی « partial » و شـــەرحو « description » پێویستە دەوری سەرەکی ببینن •

وەرگێڕانی مطلق ئەوەیە کە مانای وشەیەك بەیەك وشە بدریّ • ئەگەر وشەیەکی کوردی لە زمانی ڕووسیدا بەرانبەری وشەیەکی پڕ بە پێستی خۆی هەبێتو کە بە تەواوی مانای ئەو وشەیە بداتو ئـەو وشەیەش وشەیەکی ئاسانو سادەو ساکار بێت ، ئەوە پێویست بـە درێژە ناکات •

وەرگێڕانی جزئی ئەوەیە کە وشەیەك یەك مانا لـە ماناکانی وشە فرەواتـاکان « polysemantic » بدات •••

جگە لەو دوو جۆرە وەرگێڕانەی لـە سەرەوە باسمان کردن ، هەروەها وەرگێڕانی کۆ ـەڵە وشەی هاوواتا ( Synonym ) دەورێکی گەورەو دیاری هەیە • زور جار بەرانبەر یەك وشەی کوردی لە زمانی ڕووسیدا چەند وشەیەك بەکار دەهێنرێن ( ئەمەش لە هەموو زمانێکدا هەیە ) • جا بۆ لێکۆڵینەوەی مانای یەك وشەی کوردی بەکارهێنانی چەند وشەیەکی یەك هاوتای ڕووسی نیشانەی دەوڵەمەندی و پوختی وەرگێڕانەو لە سەرێکی تریشەوە مانای وشە ئاسان دەکات •

هەروەها ڕێ‌دەکەویّ بەرانبەر وشـەیەکی کوردی لـە زمانی ڕووسیدا دەستەواژەیەك بەکاردەهێنریّ • ئـەم جۆرە وەرگێڕانەش

بایەخی خۆی هەیەو لەمەسەلەی زانستی وشەدا « lexicology » جێگای تایبەتی وەرگرتووە .

شەرحی وشە بەتایبەتی پێویستە لە کاتێکدا بەکاربهێنرێ کە لە زمانی ڕووسیدا وشەیەکی هاوواتا نەبێت بۆ دانی مانای وشەیەکی کوردی . هەروەها « فەرهەنگنووس دەبێ گرنگی بدات بەوەی شەرحی وشەکان بە کورتی بکات ، بە مەرجێك ئەو کورتییە نەبێ بەهۆی نەکردنەوەو ئاشکرا نەبوونی مانای وشەکان »[15] . جگە لەوە پێویستە شەرح کراوە بێتو بە وشەی ئاسانو سادە بێت .

یەکێ لە ئەرکە سەرەکیەکانی فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ڕوونکردنەوەی مانای وشەیە . جگە لەوە نیشاندانی چۆنیەتی بەکارهێنانی وشەش پێویستە لە کاری فەرهەنگنووسیدا .

بێگومان بۆ تێگەیشتنی مانای هەندێ وشە ڕوونکردنەوە دەورێکی گرنگی هەیە . ئەمەش لە سەرێکەوە کاری خوێنەر ئاسان دەکاو لە سەرێکی تریشەوە شێوازێکی زانستی دەدات بە فەرهەنگەکە .

هەروەها پێویستە بەشێکی زۆری وشەکان بخرێنە ناو ڕستەیەکی کورتو ئاسانەوە ، تاکو مانای وشەکان باشتر ئاشکرابێنو تا خوێنەر لەو ڕێگایەوە بزانێ چۆن ئەو وشانە لە ڕستەدا بەکار دەهێنرێن . جگە لەوە ل. ف. شێربا دەڵێ : بەپێی وشەی زمانێك لەگەڵ زمانێکی تردا تەنها ئەوە نیە کە بەرانبەر یەکنو هاوواتان ، بەڵکو پێوەندیی ئاڵۆزو جیاواز هەیە لە شێوەی بەکارهێنانیاندا[16] .

---

(١٥) ئا . ك . باروئکوف ، لە تەجروبەی فەرهەنگ داناندا ، « گۆڤاری فەرهەنگنووسی » ، مۆسکۆ ١٩٦٧ ، ل ١٤٠ ، ( بە زمانی ڕووسی ) .

(١٦) سەرچاوەی ناوبراو ، ل . ف . شێربا .

ئەگەر لەم ڕووانەوە تەماشـــای فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی
ئاوبراو بکەین ، دەبینین بەگشتی دانەرانی لــە چۆنیەتی وەرگێڕانو
لێکدانەوەی مانای وشـــەکانی فەرهەنگەکەیاندا لــە هەمان کاتدا
هونەرێکی بەرزیان نواندووەو بە زمانێکی ڕەوانو ئاسان ، بە وشەی
بەرانبەری پڕ بە پێستی خۆی شەرحی وشەکانیان کردووەو مانایانیان
لێکداوەتەوەو هەر وشەیەك چەند مانای هەبێت هەموو ماناکانیان بە
ڕووسی نووسیوە ، بەمەو هەروەها بە هێنانەوەی گەلێـــك ئیدیۆمو
پەندی پێشینانو قسەی نەستەق توانیویانە دەوڵەمەندیی زمانی کوردی
نیشان بدەن • لە لایەکی ترەوە دە کوردۆو دە زاریی زوربەی وشەکانی
فەرهەنگەکەیان خستۆتە ڕستەوەو وەریانگێڕاون بۆ ڕووسیو لــەم
ڕێگەیەوە تێگەیشتنو بەکارهێنانی وشەکانیان ئاسان کردووە ، خۆ
ئەگەر وشەیەکی کوردی لــە ڕووسیدا بەرانبــەری نەبێ ، ئەوە بە
شەرحێکی کورتو ئاشکرا مانای ئەو وشەیەیانداوە بەدەستەوە •

× × ×

ئنجا با تەماشایەکی هونەری ڕێك خستنی فەرهەنگەکە بکەین :

١ ــ ڕیزکردنی وشە کوردییەکان •

بۆ ئەم جۆرە فەرهەنگە تاکە ڕێگای ڕیزکردنی وشە ئەوەیە کە بە
گوێرەی ئەو زنجیرە ئەلفوبێیە بێــ کە لە نووسینی کوردیدا هەیە •
بەڵێ دانەرانی فەرهەنگی کوردی ــ ڕووسی ئەم ڕێگەیەیان گرتووەو
بێگومان بۆیە خوێنەر لە دۆزینەوەی وشەدا هیچ گیروگرفتێك نایەتە
ڕێگایو بە ئاسانی ئەو وشەیەی پێویستی بێ دەیدۆزێتەوە •

٢ ــ وشەی هاوبێژ ( homonym )

چۆن لەگشت زمانێکدا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا وشە هەن
کە بە خوێندنەوەو نووسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە ، وەك :

بیر ــ بیرو هۆش

بیر ــ ( بئر ــ عەرەبی )

باو ــ دەستوور : فیسار شت بووە بە باو

باو ــ باوك

باو ــ زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا •

بێ‌گومان ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان‌بردن لەو وشانە نین کە مانایان زۆرە ــ واتە وشەی فرەواتا( polysemantic )نین ، بەڵکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوەو نووسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتاو پەیدابوونیاندا جیاوازن ، وەك ( « بیر » ــ بیرو هۆش ) کــە وشەیەکی کوردیە زۆر دوورە لە ( « بیر » ــ بئر ) کــــە وشەیەکی کوردی نییەو لــە پەیدابوون‌و دروســـت بووندا سەرچاوەیەکی تری هەیە • یاخود « باو » دەبینین سێ وشەن کە مانایان جیاوازەو لــەیەك دوورن • هەرچەندە هەرســــێکیان لەرەســــەندا کوردین ، بەڵام پەیدابوون‌و دروست‌بوونیان لە رێگای جیاوازەوە هاتووە • جا ئــەم جۆرە وشانە کە لە لێکسیکۆلۆژیدا وشەی هاوێژ ( homonym )یــان پێ دەڵێن ، پێویستە لەگەڵ وشەی فرەواتا ( polysemantic ) لەیەك جیابکرێنەوەو تێکەڵ نەکرێن‌و لە فەرهەنگیشدا وەك ئەو شێوەیەی لە سەرەوە نووسراون ــ واتە بە یەك وشە دانەنراون ــ تۆماربکرێت ••
شایانی باسە ، کە دە کوردۆو دە زارێ لە رێکخستنی فەرهەنگەکەیاندا لەسەر ئەو رێگا زانستیەیە رۆیشتوون • ئەو رێگایەش ئەوەیە کە ئەو جۆرە وشانەی ناومان بردن بە یەك وشە دانەنراون‌و نەخراونەتە ریزی ئەو وشانەی کە مانایان زۆرە( polysemantic )و جیا کراونەتەوەو بە وشەی جیاوازو سەربەخۆی هاوێژ( homonym ) دانراون‌و سەرلەنوێ لە سەری دێڕ وەك وشەیەکی تایبەتی نووسراون‌و ژمارەیان بۆ دانراوە •

### ٣ ـ وشەی فرەواتا ( polysemantic )

لـە زمانی کوردیشدا ، وەکو هەموو زمانەکانی‌تر وشـە هەن کـە تەنها یەك مانایان هەیەو وشـەش هەن کـە مانایان زۆرە . بۆ نموونە دەبینین کە هەندێ وشە ، وەك : ( شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ... هتد ) لە یەك مانا زیاتریان نییە ، بەڵام وشەش هەن مانایان زۆرەو ئەو مانایانەش لە یەك نزیکن ، وەك :

جۆش سـەندن : (١) هاتنە کوڵی شتی شـل لەسەر ئاگـر ، (٢) برینی‌یە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا ؛ (٣) گەرم‌بوونی یەکێك لە کارێکدا .

دانـەرانی فەرهەنگی ناوبراو بۆ ئاسـانکردنی بەکارهێنـانی فەرهەنگەکەو کێشانی سنوور لە نێوان ماناکانی یەك وشـەدا باش ماناکانیان لەیەك جیاکردۆتەوە . ئەوانەی ئەم فەرهەنگە بەکار دەهێنن لەم رێگەیەوە لە تێگەیشتنی مانای وشەدا تووشی هەڵەو زەحمـەت نابن‌و ئەو زاتانەش کە فەرهەنگەکەیان داناوە ، جگە لەوەی بەم کارە شێوازێکی زانستی‌یان بەکارەکەیان داوە ، هەروەها هەندێ کێشەی زانستی وشەشیان چارکردووە .

### ٤ ـ وشەی هاوواتا ( Synonym )

بەو وشانە دەڵێین کـە یەك مانا دەبەخشن یاخود مانایان لێـك نزیکە ، بەڵام لە خوێندنەوەو نووسینیاندا جیاوازن ، وەك : ( لێڕ ـ دارستان ـ جەنگەڵ ، ئاوارە ـ پەڕیوە ـ دەربەدەر ؛ ئەوین ـ ئەڤین ـ دڵداری ـ عیشق ، تووش ـ دژوار ـ سەخت ـ ناخۆش ... هتد ) .

بێ گـومان بۆ فەرهەنگی ناوبراو پێویـست بە وەرگێـڕان‌و لێکدانەوەو شەرحی هەموو ئەو وشـانە ناکات ، بۆیە دانەران مانای

وشەی یەکەمیان ( واتە ــ بەگوێرەی زنجیرەی ئەلفوبێی کوردی ) یاخــود هەرە ناسراویان داوەو لەبەردەم ئەوانی تردا نووســیویانە : بڕوانە فلان وشە . خۆ ئەگەر جیاوازییەکیش لە نێوانیاندا هەبێــت دەستنیشانیان کردووە .

ئەم شێوەیە نەك هەر ڕێگا کورت دەکاتەوە ، بەڵکــو نیشانی خوێنەریشی دەدات کــە « وەتەن »و « نیشــتمان » ، « ئەوین »و « ئەڤین »و « عیشق »و « دلداری » ، « خاپوور »و « وێران » ... هتد خاوەنی یەك مانان . هەروەها بەمەش یەکێك لەکێشەکانی زانســتی وشە خاوکراوەتەوە .

**٥ ــ هەندێ نیشانە بۆ ئاسانکردنی کاری چــاپو سووککردنی باری فەرهەنگەکــە :**

بۆ ئاسانکردنی کاری چاپو سووککردنی باری فەرهەنگەکەو خوێنەران چەند نیشانەیەکیان بەکارهێناوە . بە وێنە :

أ ــ لەکاتی خــستنە ڕستەی وشەیەکدا بۆ دووپات کردنەوەی وشەکە هێڵێك بەم جۆرە (ــ) کێشراوە ، وەك :

(دڵ) ــ م پێ ســووتا
ئــەو پیاوێکی بە ــ ە
(کار) ــ لــە ــ ترازان

ب ــ زۆر جار بۆ ڕوونکردنەوەی وشــەیەك لــە نێوان دوو کەواندا نووسیویانە کە ئەو وشەیە سەر بە چی پۆلە وشەیەکە ، وەك :
ناو ، جێناو ، کردار ( تێپەڕ ، تێنەپەڕ ... ) ... ، نەبات ... پزیشکی ... قسەی نەستەق ... هتد . بۆ تەواو ئاسانکردنی ئــەم مەبەستە پیتێکیــان کردووە بە نیشانەو لــە پێشــەکی فەرهەنگەکەدا باسیان کردووە .

ج ــ بۆ جیاکردنەوەی وشەو فرێزی بەرەڵلا[17] لە ئیدیۆم‌و دیاری‌کردنی ئیدیۆم ، لە بەردەم هەر ئیدیۆمێکدا ئەم نیشانەیە ◇یان داناوە :

... وگەلێکی‌تر .

بێ‌گومان ئەم شێوازە ڕێی کورت کردووەتەوەو باری چاپی ئاسان کردووەو هەر لەبەر ئەوەشە کە لە تێکڕای فەرهەنگی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا پەیڕەوی دەکرێ .

هەروەها د. کوردۆ لە بیست لاپەڕەی کۆتایی فەرهەنگەکەدا هەندێ جەدوەلی بۆ گەردانی ڕێژەی جۆر بە جۆری کردار ڕێکخستووەو ئەم بەشەش بە تەواوی بە فەرهەنگەکە خۆیەوە بەستراوەو کەڵکی زۆرە بۆ بەکارهێنانی‌و بۆ فێربوونی زمانی کوردی .

سەرەڕای ئەمانە هەموو گەلێک ڕووی تری گرنگ لە فەرهەنگەکەی د. کوردۆو د. زارێ‌دا بەدی دەکرێ ، هەرچەندە ئەمەش وا ناگەیەنێ کە ئەو فەرهەنگە کەم‌و کورتی تێدا نییە ، بەڵام ئەوەندە هەیە کەم‌و کورتیەکانی لە نرخی بەرزی کەم ناکەنەوە ، بەتایبەتی ئەگەر بێتوو ئەوەش لەیاد نەکەین کەوا دانەرانی سوودیان لە تەجروبەی فەرهەنگ‌نووسانی کوردو ئەوروپا وەرگرتووەو ئەمەش بووە بە هۆی سەرکەوتنی فەرهەنگەکەو بە هۆی نووسینی لەسەر شێوازێکی زانستی . بەم جۆرە ئەم فەرهەنگە بە یەکێك لە فەرهەنگە بەرزەکانی کوردی دەژمێررێت‌و بەرهەمێکی گەورەی زانستی‌یە لە کاری کوردناسیی سۆڤێتدا(*) .

---

(17) بۆ وەرگرتنی زانیاری سەبارەت بە فرێزی بەرەڵلا ، بڕوانە :
د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل ٥٦ ــ ٦٠ .

**(*) ئەم وتارە لە ( ل ٢٢ ــ ٢٩ )ی ژمارە ( ١٧ )ی ساڵی ١٩٨٤ی گۆڤاری (( کاروان ))دا بڵاوکراوەتەوە .**

# موجز تاريخ وضع القواميس الكردية

## - ١ -
## منذ البدء حتى الحرب العالمية الاولى

بدأ العمل في حقل وضع القواميس الكردية منذ أمد طويل . وان واضع أول قوبميس كردي كان رجلا كرديا . ففي عام ١٠٩٤هـ\١٦٨٢ – ١٦٨٣م وضع الشاعر الكردي العظيم الخالد الذكر احمدي خاني قوبميسا عربيا ـ كرديا منظوما للصبية الكرد ، أسماه « نوبهار » واعيد طبعه لمرات عديدة .

اولا ـ ضمن ملحق قاموس يوسف ضياء الدين باشا الخالدي[1] .

ثانيا ـ في كتاب ( ليكوك ) العالم الالماني[2] ...

على أن اول قاموس كردي تم وضعه من لدن الاوروبيين هو ذلك القاموس الايطالي ـ الكردي الذي نشره القس الايطالي ( ماوريزو گارزونى Maurizio Garzoni ) عام ١٧٨٧ في روما[3] ضمن ملحق

---

(١) يوسف ضياء الدين باشا الخالدي المقدسي . الهدية الحميدية في اللغة الكردية . استنبول ، ١٣١٠ هـ – ١٨٩٣ م .

(٢) Le Coq, Kurdische Texte, Berlin, 1903; T. I. II.

(٣) Maurizio Garzoni, Grammatica e vocabolario della ligua kurda, Roma, 1787.

كتابه حول اللغة الكردية . وهو يؤلف بمجموعه قرابةخمسة آلاف كلمة ايطالية مفسرة بلهجة العمادية . اما ما يتعلق بتفسير المفردات وشرحها وايضاحها فعمل ناجح وموفق بالنسبة الى الفترة التي وضع فيها ، بل انه بالرغم من مضي ( ٢٠٠ ) عام على طبعه ، ما زال محط فائدة وشائع الاستعمال .

وفي عام ١٢١٠ هـ ــ ١٧٩٥م وضع الشيخ معروف النودهي قويميسا عربيا ــ كرويا منظوما سماه ( أحمدي ) ، وقد طبع سنة ١٩٣٦ مرتين ، مرة في السليمانية[٤] . ومرة في بغداد[٥] . وما خلا الاعمال التي اسلفنا ذكرها آنفا، وحتى منتصف القرن التاسع عشر لم ينجز شيء من هذا القبيل جدير بالذكر ، اللهم الا (٢٠٠) كلمة دونها ريج[٦] و (٢٧٣) كلمة دونت في قاموس للمقارنة بين سائر اللغات واللهجات[٧] .

---

(٤) شێخ مەعروفی نۆدێیی « احمـدی » ، سلێمانی ، ١٩٣٦ ( الشيخ معروف النودهي « أحمدى » ، السليمانية ، ١٩٣٦ ) .

(٥) شێخ مەعروفی نۆدێیی « احمدی » بغـدا ، ١٩٣٦ . ( الشيخ معروف النودهي « احمدى » بغداد ، ١٩٣٦ ) .

(٦) C. J. Rich. Narrative of a residence in Koordistan and on the site of ancient Niniveh, .......... London, 1836—1837. pp. 394—398.

(٧) П.С. Паллас. Сравнительные словари всех языков и наречий, СПб., 1787, ч. I, № 77

( پ . س . پالاس ، قاموس مقارن لجميع اللغات واللهجات ، سانت بطرسبرغ ، ١٧٨٧ ، الجزء الاول ) .

الا أنه ما ان أطل النصف الثاني من القرن التاسع عشر حتى راج البحث في اللغة الكردية عموما وفي وضع القواميس الكردية خصوصا٠ففي الاعوام ١٨٥٦ و ١٨٥٧ و ١٨٥٨ نشر المستشرق والعالم الكبير ــ بيوتر لرخ ثلاثة كتب حول الكرد وكردستان(٨) تعد حتى يومنا هذا نادر المثال في مكتبة الدراسات الكردية ، وتعتبر من المراجع الاصيلة • يحتوي كتابه الثالث على قاموس كردي ــ روسي( ص ١ ــ ٨٤ ) و كردي ( زازائي ) ــ روسي ( ص ٨٥ ــ ١٠٨ ) •

اما آ٠جابا فعلاوة على خدماته في تدوين الآثار الفولكلورية الكردية والبحوث القيمة عن الكرد ولغتهم فقد قام بعمل عظيم في ميدان وضع القواميس الكردية • والى هذا العالم الجليل يعود فضل تأليف أول قاموس كردي ــ فرنسي نشره فرديناند يوستى بأمر من الاكاديمية الروسية سنة ١٨٧٩(٩) • ويقع القاموس المذكور في ( ٤٦٣ ) صفحة و ( ١٥ ) ألف كلمة كردية ، هذا عدا الشروح والايضاحات الفارسية والعربية والتركية ، كما أنه وضع قاموسين آخرين : فرنسيا ــ روسيا ــ كرديا ، وكرديا ــ فرنسيا ــ روسيا ، ألا انهما ما زالا مخطوطين محفوظين في أرشيف أكاديمية العلوم السوفيتية في لينينگراد •

---

(٨) П. Лерх. Исследования об иранских курдах и их предках северных халдеях, СПб., 1856, 1857, 1858

( ب ٠ ليرخ ، بحوث عن الاكراد الايرانيين واجدادهم الخالديين الشماليين ، سانت بطرسبورغ ، ١٨٥٦ ، ١٨٥٧ ، ١٨٥٨ ) •

(٩) A. Jaba, Dictionnaire kurde-francais, St-Petersbourg, 1879.

أما س • ری المبشر الامريكي الذي أمضى فترة طويلة في منطقة حكاري فقد نشر عام ١٨٧٠ موجزا لقواعد اللغة الكردية(١٠) مردفا بتويميس كردي ــ انجليزي يقع في (٢٠) صفحة •

وما ان اشرف القرن التاسع عشر على نهايته حتى بادر المستشرق آ • سوتين بنشر كتاب حول قواعد اللغة الكردية(١١) كرس القسم الثالث منـه لقويميس كردي ــ ألماني ( ص ٢٨١ ــ ٣٤١ ) •

وفي كتاب س • آ • يگيزاروف الذي الفه في اثنوغرافيا الكـرد(١٢) نجد قويميسين : أحدهما كردي ــ روسي (ص١ ــ ٦٥) يضم حوالي ثلاثة آلاف كلمة ــ وثانيهما روسي ــ كردي ( ص ٦٦ ــ ١٢٢) يضم حوالي أربعة آلاف كلمـة •

---

(١٠) S. A. Rhea. Brief Grammar and vocabulary of the Kurdish Language of the Hakari district in "Journal of the American Oriental Society", New Haven, 1872. Vol. X.

(١١) E. Prym and A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt I. II, S. Pbg, 1887—1890.

(١٢) С.А. Егизаров. Краткий этнографический очерк курдов Эриванской губернии, "Записки Кавказского отдела императорского Русского географического общества", книжка XIII, выпуск 2, Тифлис, 1891

( س . ا . يگيزاروف ، موجز تاريخ الاثنوغرافيا الكردية لمحافظـة اريفان « تقارير القسم القفقاسي للجمعية الجغرافية الامبراطوريـة الروسية » ، تفليس ، ١٨٩١ ) .

وفي عام ١٨٩٣ نشر يوسف ضياء الدين باشا الخالدي في استانبول قاموسا كرديا ــ عربيا [١٣] يقع في (٣١٩) صفحة ، فهو يعد بحق أثرا قيما في حقل القواميس الكردية[١٤] .

وفي ملحق الكتاب الذي نشره ميجرسون سنة ١٩١٣ في لندن[١٥] نجد قويميسا انجليزيا ــ كرديا ( ص ١٧٠ ــ ٢٨٩ ) ، كما أننا نجد في كتابه الآخر الذي طبع في بغداد سنة ١٩١٩ قويميسا انجليزيا ــ كرديا يقع في سبعين صفحة[١٦] .

وفي سنة ١٩١٦ نشر ف . نيكيتين في اورمية قويميسا روسيا ــ كرديا[١٧] . وفي أعقاب ذلك بثلاث سنوات صدر كتاب في قواعد اللغة

---

(١٣) انظر المرجع المذكور ، يوسف ضياء الدين باشا الخالدي المقدسي . الهدية الحميدية في اللغة الكردية ، استنبول ، ١٣١٠ هـ ــ ١٨٩٣ م .

(١٤) للوقوف على معلومات اكثر بشأن هذا القاموس ، راجع : مامؤستا نەجمەدین مەلا ، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری کوردان ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ؛ ژ ١٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢١ ــ ٢٥ . ( الاستاذ نجم الدين ملا ، كنز الاكراد المملوء من الجواهر ، مجلة « ڕۆژی نوێ »، العدد ١٢ ، السليمانية ، ١٩٦٠ ، ص ٢١ ــ ٢٥ ) .

(١٥) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(١٦) E. B. Soane, Elementary Kurmanji Grammar, Baghdad, 1919.

(١٧) В. Никитин. Краткий русско-курдский военный переводчик, Урмия, 1916

( ف . نيكيتين ، ترجمان حربي روسي ــ كردي مختصر ، اورميا ، ١٩١٦ .

الكردية للمبشر الامريكي ل • و • فاسوم[١٨] وهو يضم قويميسا يقع في ١٦ صفحة ( ص ٢٦٢ ــ ٢٧٨ )

ــ ٢ ــ

## بعد الحرب العالمية الثانية

**في كردستان :**

وفي الثلاثين من القرن العشرين يبدأ دور جديد في تاريخ تأليف القواميس الكردية ، وذلك كاحدى حصائل تعاظم الوعي القومي وتعمقه الذي كان من ثماره الثقافية المهمة اهتمام المثقفين الكرد انفسهم بالابحاث اللغوية والادبية والتاريخية لشعبهم • الا ان العمل في مضمار تأليف القواميس الكردية ظل حتى عام (٥٠) محدود الاطار بطيئا تشوبه السذاجة والبساطة، والذي نشر منه في تلك الفترة ويستحق الذكر لم يتعد ما يأتي :

اولا ــ قائمة المصطلحات الاجتماعية والسياسية التي نشرها جلادت بدرخان بعنوان ( قويميس كردي ) خلال الثلاثينات على صفحات مجلة « هاوار » وثانيا تلك المصطلحات التي نشرها الاستاذ علاءالدين سجادي في مجلة « نزار » ، وثالثا قويميس الاستاذ شاكر فتاح الذي طبعه عام ١٩٣٤[١٩] ، ورابعا القاموس العربي ــ الكردي الذي وضعه الاستاذ عبدالله

---

(١٨) L. O. Fossum, A practical Kurdish grammar, Minneapolis, 1919.

(١٩) شاكر فەتاح ، فەرهەنگۆك ، ئینگلیزی ــ کوردی ، وە کــوردی ــ ئینگلیزی ، رەواندوز ، ١٩٣٤ . ( شاكر فتاح ، قويميس ، انجليزي ــ كردي ، وكردي ــ انجليزي ، رواندوز ، ١٩٣٤ )

زيوەر سنة ١٩٤١[٢٠] .

الا أنه بعد السنوات العشرين الاخيرة خطا بعض الاساتذة المخلصين في هذا المضمار خطوات كبيرة ، فنشروا عددا من القواميس القيمة وتقدم بذلك التأليف القاموسي وازدهر بصورة ملحوظة ، يعد الاستاذ گيو الموكرياني ذا دورمشهود فيما قدمهالىتاريخوضع القواميس الكردية حيث امضى من سني شبابه وكهولته عشرات الاعوام في العمل الدائب لهذا الغرض والف عددا من القواميس ومنه :

المرشد : وهو قاموس مدرسي عربي ــ كردي طبع في مطبعة كردستان بأربيل سنة ١٩٥٠[٢١] . ويضم هذا القاموس حوالي ( ١٥ ) ألف كلمة عربية مفسرة بالمفردات الكردية . وقد وفق في شرح المفرادت ، ولاسيما المفردات العربية التي ليس لها مقابل في الكردية . وعلى الرغم من مضي قرابة ( ٢٠ ) عاما على طبع هذا القاموس فانه ما زال موضع فائدة كبيرة .

وفي عام ١٩٥٥ نشر قاموس كردي ــ عربي ــ فارسي ــ فرنسي ــ انجليزي تحت عنوان ( كولكه زيرينه ــ قوس قزح )[٢٢] موزعة مفرداته

---

(٢٠) مترجم من قاموس « اختري » ، وهو كما كتب المؤلف نفسه ــ قد تم في الخامس والعشرين من تموز سنة ١٩٤١ . غير أنه ــ للاسف ــ لم يطبع بعد ومازال مخطوطا ، محفوظا في مكتبة « المجمع العلمي الكردي » .

(٢١) گيو موكرياني ــ «رابەر»، فەرهەنگێكی قوتابخانەیی عارەبی وكوردی‌یە، هەولێر ، ١٩٥٠ . گيو الموكرياني « المرشد » ، قاموس مدرسي في اللغتين العربية والكردية ، اربيل ، ١٩٥٠ ) .

(٢٢) گيو موكرياني ــ « كۆلكەزێرینە » ، كوردی ــ فارسی ــ عەرەبی ، فەرەنسی ــ ئنگليزی ، چاپی یەكەم ، هەولێر ، ١٩٥٥ . ( گيو الموكرياني ــ « كۆلكەزێرینە » ، قاموس كردي ــ فارسي ــ عربي ــ فرنسي ــ انجليزي ، الطبعة الاولى ، اربيل ، ١٩٥٥ ) .

على (٥٩) موضوعا صغيرا • ونصادف في كل موضوع معظم المفردات التي تخصه •

ومع ما فيه من بعض النواقص الا ان معظم تلك النواقص انما تقع على عاتق تأخر التأليف القاموسي الكردي في تلك المرحلة •

وفي عام ١٩٦٦ أصدر الاستاذ گيو الموكرياني الطبعة الثانية لـ (كولكه زيرينه ـ قوس قزح) منقحة ، مضيفا اليها ما جعلها تختلف اختلافا كبيرا عن الطبعة الاولى بما اجرى فيها من اصلاح واكمال للنواقص التي شابتها[٢٣]

كما أنه نشر سنة ١٩٦١ قاموسا كرديا ـ عربيا بعنوان ( مهاباد )[٢٤] وهو قياسا الى سوابقه من القواميس التي وضعها المؤلف أجود وأقرب الى الكمال وأبعد عن النواقص ، سواء اكان من حيث غزارة المفردات التي يحويها ام من حيث طريقة وضعه وأسلوب ترتيبه • يبلغ عدد مفرداته الكردية قرابة (٣٠) ألف كلمة ، أي ضعف القاموس المرشد • وقد نهج في ترتيب المفردات وتنظيمها وطريقة تفسيرها وشرحها منهجا جديدا وصحيحا وطريفا •

وعدا ما ذكرنا فقد وضع الاستاذ گيو الموكرياني ( قاموس كردستان )

---

(٢٣) گيو موكريانى ـ « كۆلكەزێرینە » ، كوردى ـ فارسى ـ عەرەبى ـ فەرەنسى ـ ئینگلیزى ، چاپى دووەم ، هەولێر ، ١٩٦٦ • ( گيو الموكرياني ـ « كۆلكەزێرینە » ، قاموس كردي ـ فارسي ـ عربي ـ فرنسي ـ انجليزي ، الطبعة الثانية ، اربيل ، ١٩٦٦ ) .

(٢٤) گيو موكريانى ـ « مەهاباد » ، فەرهەنگێكى قوتابخـانەبى كوردى وعەرەبى‌يە ، هەولێر ، ١٩٦١ • ( گيو موكرياني ـ « مهاباد » ، قاموس مدرسي في اللغتين العربية والكردية ، اربيل ، ١٩٦١ .

ايضا الا أنه ما زال غير مطبوع ، وهو قاموس كردي ـ كردي[٢٥] . وفي ميدان اللغة والادب والتاريخ الكردي يبرز الشيخ محمد مردوخ هو الآخر كعالم كردي له الفضل في حقل وضع القواميس الكردية . ومن الجدير بالاشارة أنه وضع سنة ١٩٥٦ قاموسا كرديا ـ فارسيا ـ عربيا وطبعه في طهران [٢٦] وعمله هذا يعد بحق جهدا كبيرا وانجازا قيما سد ثغرة كبيرة في حقل وضع القواميس الكردية . ومع ذلك فلا يخلو من بعض النواقص وذلك كحشره لبعض المفردات المفتعلة التي لا أساس لها في الكردية ولا تتفق مع قواعدها ، او اقحامه لبعض الالفاظ العربية والفارسية التي لا يمكن ان يستخدمها الكردي بأي حال من الاحوال . هذا علاوة على ما يشوب تفسير المفردات وايضاحها من نقص واضطراب وعدم الدقة ..

بيد أن هذه النواقص لا تقلل من قيمة هذا الانجاز العلمي الرائع ، وان جوانبها الموفقة تغطيها ولا تكاد يحس بها .

وحتى عام ١٩٦٠ لم يكن يتوافر لدينا قاموس كردي ـ كردي غير ان الاستاذ الشيخ محمد الخال استطاع بحرصه ونشاطه أن يملأ هذا الفراغ

---

(٢٥) للوقوف على معلومات أوفى بشأن قواميس الاستاذ گيو الموكرياني ، انظر : ئەورەحمانی حاجی مارف ، چالاکی ماموٚستا گیو موکریانی لە میژووی فەرهەنگ نووسینی کوردیدا ، روٚژنامەی « هاوکاری » ، ژ ١٠٠ ـ ١٠٤ ، بەغدا ، ١٩٧٢ . ( عبدالرحمن الحاج معروف ، نشاط الاستاذ گيو الموكرياني في تاريخ وضع القواميس الكردية ، جريدة « هاوكاري » ، العدد ١٠٠ ـ ١٠٤ ، بغداد ، ١٩٧٢ ) .

(٢٦) شێخ محەمەدی مەردوٚخ ، فەرهەنگی « مەردوٚخ » ، تاران ، ١٩٥٦ . ( الشيخ محمد مردوخ ، قاموس « مردوخ » ، طهران ١٩٥٦ ) .

فاصدر سنة ١٩٦٠ ـ ١٩٦٤ جزءين من ( قاموس الخال )[٣٧] منتهيا بهما الى حرف ( ف ) أما تكملته فمعدة للطبع •

يعد قاموس الخال أحد القواميس الكردية الناجحة ، وانجازا عظيما ثمينا رتب في الجملة بأسلوب جميل وصحيح وقد تلافى فيه الاستاذ الخال الكثير من الاخطاء والعيوب والنواقص والتعقيدات التي تشوب القواميس الاخرى التي سبقته •

وبصدد تفسير المفردات وايضاحها فانه يسلك عدة طرائق صحيحة وعلمية : يكتفي بايراد المرادف للمفردات التي يمكن تفسيرها بمرادف واحد ، فيما يشرح ويوضح ويفسر ما يحتاج الى الشرح والتفسير من المفردات الاخرى ، وفي كثير من المناسبات يعمد الى ايراد الجمل السهلة امعانا للتيسير وايغالا للدربة على استخدامها •

وعلى الرغم مما يرد على قاموس الخال من بعض العيوب والنواقص الا أنها ليست بالدرجة التي تقلل من قيمته ــ وعموما فان قاموس الخال قاموس ناجح وعمل مهم وثمرة جهود مضنية للاستاذ الخال بذلها خلال اعوام طوال ، وهو يمثل فنا عاليا لوضع أول قاموس كردي ــ كردي[٣٨] •

---

(٢٧) شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهەنگی « خاڵ » ، ب ١ ــ ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ــ ١٩٦٤ . ( الشيخ محمد الخال ، قاموس « الخال » ، الجزء الاول والثاني ، السليمانية ، ١٩٦٠ ــ ١٩٦٤ ) .

(٢٨) تحت عنوان « فەرهەنگی خاڵ ــ قاموس الخال » في الاعداد ١٩ ــ ٢٢ من جريدة « هاوكاری » لعام ١٩٧١ ، وتحت عنوان « چەند ړوونكردنەوە و بەڵگە و تێبینییەكی نوێ دەربارەی فەرهەنگی خاڵ ــ بعض الايضاحات والاستنتاجات والملحوظات حول قاموس الخال » في الاعداد ١٠٥ ــ ١٠٨ من الجريدة نفسها لعام ١٩٧٢ نشرت سلسلة مقالات حول القاموس المذكور متحدثا باسهاب عن كثير من جوانب الانجاز .

وفي سنة١٩٦٢ نشر الاستاذ علاء الدين سجادي قاموسا كرديا ــ عربيا ــ فارسيا[٢٩] يتحدث في المقدمة التي دبجها بثلاث لغات ــ عن الاملاء الكردي ومشكلاته وعيوبه ، كما يتحدث في (١٥) صحيفة عن قواعد اللغة الكردية بقدر ما يخص المبادىء الاساسية لتعلم اللغة واصطناع القواميس .

وزع المؤلف مفردات هذا القاموس على ( ١٧ ) موضوعا واسعا . ومما يذكر أن معظم المفردات الواردة في أي موضوع انما يخص ذلك الموضوع بالذات وتلك هي احدى مزايا القاموس الجيد .. الا أن ثم بعض النواقص والعيوب التي تشوه بعض ملامحه : منها على سبيل المثال ، ان الاضطراب في ترتيب مفرداته من الكثرة بحيث يعقد طريق الوصول السريع الميسور الى الكلمة المطلوبة . كما أن ثم كلمات حشرت تحت الموضوعات الرئيسة حشرا دون ان يكون بينها وبين تلك الموضوعات أدنى صلة ، فيما لم يرد ذكر كثير من المفردات ذات الصلة الوثيقة بها وكان الاولى ذكرها . هذا عدا التكرار الكثير لبعض المفردات والاخطاء الاملائية التي يصادفها القارىء .

وفي عام ١٩٦٢ طبع الاستاذ جگرخوين الجزءين الاول والثاني من قاموسه الكردي في بغداد[٣٠] ، وهو قاموس كردي ــ كردي باللهجة الكرمانجية الشمالية وقد لعب وسيلعب دون شك دوره . ولكن للاسف أنه مشحون بالنواقص والعيوب . فلو قورن هذا القاموس بالقاموس ( المرشد ) للاستاذ گيو الموكرياني المطبوع سنة ١٩٥٠ او بقاموس الخال للاستاذ

---

(٢٩) عەلائەدین سەجادی ، دەستوور وە فەرهەنگی زمانی کوردی ــ عەرەبی ــ فارسی ، بەغدا ، ١٩٦٢ . ( علاء الدين سجادي ، قواعد ومعجم اللغات الكردية والعربية والفارسية بغداد ، ١٩٦٢ ) .

(٣٠) جگەر خوێن ، فەرهەنگا کوردی ، ب ١ ــ ٢ ، بەغدا ، ١٩٦٢ ( جگر خوين ، فەرهەنگا کوردی ، ج ١ ــ ٢ ، بغداد ، ١٩٦٢ ) .

الشيخ محمد الخال المطبوع جزؤه الاول سنة ١٩٦٠ لوجدنا عيوبه ونواقصه اكثر من عيوب ونواقص القاموسين المذكورين • في حين ان القاموس الكردي للاستاذ جگرخوين انما صدر بعد نشر القاموس ( المرشد ) ، وقاموس الخال ومن الملاحظ ان الاستاذ جگرخوين لم ينتفع بالقواميس الكردية السابقة التي حلت كثيرا من المشكلات وذللت مزيدا من الصعوبات[٣١] •

ومما يذكر أن موسى عنتر قد طبع سنة ١٩٦٧ في استانبول قاموسا كرديا ــ تركيا[٣٢] يعد اول قاموس من نوعه ، وهو يضم عشرة آلاف كلمة وملحقا عن بعض اصوات اللغة الكردية •

هذا وقد نشر السيد عبدالقادر البرزنجي سنة ١٩٧١ قاموسه (قاموس الاعلام )[٣٣] والسيد معروف القرداغي سنة ١٩٧٢ ــ ١٩٧٣ ( القاموس الزراعي )[٣٤] ، كما نشر الاستاذ كمال جلال غريب قاموسه الموسوم بـ ( القاموس العلمي ) سنة ١٩٧٤[٣٥] • ومما لا شك فيه أن هذه القواميس

---

(٣١) للوقوف على معلومات ضافية بشأن هذا القاموس انظر : سلسلة المقالات المنشورة في العدد ١٣٧ ــ ١٣٨ من جريدة « هاوكاری » لسنة ١٩٧٢ بعنوان « فەرهەنگەکەی ماموٚستا جگەر خوێن ــ قاموس الاستاذ جگر خوين » لكاتب هذا البحث •

(٣٢) Musa Anter. Ferhanga Kurdi—Tirki. Istanbul, 1967.

(٣٣) عەبدولقادر بەرزنجی ؛ فەرهەنگی زانیاری ، سلێمانی ، ١٩٧١ • ( عبدالقادر البرزنجي ، قاموس الاعلام ، السليمانية ، ١٩٧١ ) •

(٣٤) مەعروف قەرەداغی ، فەرهەنگی کشتەو کاڵ ، ب ١ ــ ٢ ؛ بەغدا ، ١٩٧٢ ــ ١٩٧٣ • ( معروف القرداغي ، القاموس الزراعي ، ج ١ ــ ٢، بغداد ، ١٧٩٢ ــ ١٩٧٣ ) •

(٣٥) کەمال جەلال غەریب ، فەرهەنگی زانیاری ، عەرەبی ــ کوردی ، ب ١ ــ ٢ سلێمانی ، ١٩٧٤ • ( كمال جلال غريب ، القاموس العلمي ؛ العربي ــ الكردي ، الجزء الاول ، السليمانية ١٩٧٤ ) •

الثلاثة من الاعمال العظيمة والضرورية وسدت في المكتبة الكردية عموما وفي حقل تأليف القواميس خصوصا فراغا كبيرا . ومع ما يلاحظ فيها من بعض العيوب فانها كأول تجربة موفقة وناجحة .

وفيما يتعلق بالعمل على صوغ ووضع واكتشاف وترجمة المصطلحات أنه لم يكن يجري الا بصورة بطيئة وساذجة ، غير أنه نشط في اعقاب ثورة الرابع عشر من تموز . ومن نتاجات هذا العهد مجموعة المصطلحات العلمية التي وضعت من قبل عدة لجان خاصة ونشرت في مجلة ( اليوم الجديد ) سنة ١٩٦٠ . صحيح أن فيها كثيرا من النواقص من حيث الترجمة والصياغة والنحت كما يبدو من خلال مقال الاستاذ جمال نبز[٣٦] الذي كرسه لنقد المصطلحات الرياضية في حينه الا انه نتاج لعب وسيلعب دوره لا محالة . وعقب نشر هذه المصطلحات اصدرت نقابة المعلمين في السليمانية قويميسا للمصطلحات العلمية البالغ عدد صفحاتها ٩٧ صحيفة . ومما يذكر ان الاستاذ غفور رشيد بحث في قسم المصطلحات الجغرافية ووجه اليها نقدات صائبة[٣٧] .

وفي عام ١٩٦٠ طبع الاستاذ جمال نبز قويميسا بعنوان « بعض

---

(٣٦) جەمال نەبەز ، زاراوەکانی لیژنەی ریاضیات لە ژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا : گۆفاری « رۆژی نوێ » ، ساڵی ١٩٦٠ ، ژ ٦ ، ل ١٠٢ ـ ١٠٩ ، ژ ٧ ، ل ١١٢ ـ ١٢١ ، ژ ٨ ، ل ٨٥ ـ ٩١ . (جمال نبز ، مصطلحات لجنة الرياضيات على بساط البحث ، مجلة « رۆژی نوێ » ، سنة ١٩٦٠ ، العدد ٦ : ص ١٠٢ ـ ١٠٩ ، والعدد ٧ ، ص ١١٢ ـ ١٢١ ، والعدد ٨ ، ص ٨٥ ـ ٩١ ) .

(٣٧) غەفور رەشید : سەرنجێك لە پەراوی زاراوەی زانستی کوردی ، گۆفاری « رۆژی نوێ » ، ساڵی ١٩٦٠ ، ژ ١٢ ، ل ٢٧ ـ ٣٥ . ( غفور رشيد ؛ نظرة حول كتاب المصطلحات العلمية الكردية ، مجلة « رۆژی نوێ » ، سنة ١٩٦٠ ، العدد ١٢ ، ص ٢٧ ـ ٣٥ ) .

المصطلحات العلمية »[٣٨] . كما نشر في سنة ١٩٦٠ ــ ١٩٦١ مئة نسخة منه بالرونيو ( من القوييس العلمي )[٣٩] يضم الاول زهاء ٣٠٠ والثاني زهاء ٣٠٠٠ مصطلح .

ومن جراء الظروف الشاذة في كردستان لم يطبع خلال عشر السنوات الماضية شيء يذكر في هذا الباب . الا أنه بعد اتفاقية آذار التاريخية بدأنا نحس بالنشاط في هذا الحقل : في سنة ١٩٧١ طبع قوييس من قبل لجنة خاصة من الملمين باللغة الكردية المقتدرين بعنوان « قوييس المصطلحات لمحافظة السليمانية »[٤٠] وهو يضم مجموعة من المفردات والمصطلحات الكردية العربية ويحوي حوالي (١٤٠٠)كلمة خاصة بالمصطلحات المتداولة في الدوائر والمؤسسات الحكومية[٤١] . كما خصصت مديرية الدراسة الكردية العامة سنة ١٩٧٢ العدد الرابع من مجلتها « التربية والمعرفة »

---

(٣٨) جەمال نەبەز ، هەندێك زاراوەی زانستی سلێمانی ، ١٩٦٠ . (جمال نبز ، بعض المصطلحات العلمية ، السليمانية ، ١٩٦٠ ) .

(٣٩) جەمال نەبەز ، فەرهەنگۆکی زانستی ، هەولێر ، ١٩٦٠ ــ ١٩٦١ . ( جمال نبز ، القوييس العلمي ، اربيل ، ١٩٦٠ ــ ١٩٦١ ) .

(٤٠) زاراوەی پارێزگای سلێمانی ، سلێمانی ، ١٩٧١ . ( مصطلحات محافظة السليمانية ، السليمانية ، ١٩٧١ ) .

(٤١) للحصول على معلومات أوفى حول هذا القوييس انظر : ئەورەحمانی حاجي مارف ، چەند سەرنجێك دەربارەی زاراوی پارێزگای سلێمانی ، رۆژنامەی « هاوکاری » ، بەغدا ، ١٩٧٣ ژ ١٦١ ــ ١٦٢ ــ عبدالرحمن الحاج معروف ، بعض الملحوظات بشأن مصطلحات محافظة السليمانية ، جريدة « هاوكاری » ، بغداد ، ١٩٧٣ ، العددين ١٦١ ــ ١٦٢ .

نشر معظم المصطلحات المدرسية في قويسيس يقع في ١٩٦ صحيفة[٤٢] • كما نشرت سنة ١٩٧٤ في العدد السابع والثامن مجموعة اخرى من المصطلحات المدرسية[٤٣] •

وقد شمر المجمع العلمي الكردي عن ساعده للعناية بهذه الناحية ، منتهجا طريقة علمية لتقديم نتاج ناضج في هذا المجال • فقد تم في المجمع لحد الان اختيار عدد كبير من المصطلحات الكردية وصياغتها ؛ ونحتها • ونشرت حصيلة هذا المجهود بثلاث قوائم في اعداد مجلة المجمع الصادرة لحد الان[٤٤] ثم جمعت في كتابين مستقلين[٤٥] • ورغم بعض النواقص ان وجدت فان ما يمتاز به هذا العمل من دقة ونقاء وما اتتهج فيه من اسلوب علمي يحملنا على الاعتقاد بأنه عمل منقطع النظير حتى اليوم في هذا الميدان •

---

(٤٢) انظر : مجلة « پەروەردە و زانست ـ التربية والمعرفة » ، بغداد ، العدد ٤ ، ١٩٧٢ •

(٤٣) انظر : مجلة « پەروەردە و زانست ـ التربية والمعرفة » بغداد ، العدد ٧ ـ ٨ ، ١٩٧٤ •

(٤٤) انظر : « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، المجلد الاول ، العدد الاول ، ص ٤١٩ ـ ٥٢٦ ، المجلد الثاني ، العدد الاول ، ص ٨٩٤ ـ ٩٤١ ، المجلد الثاني ؛ العدد الثاني ، ص ١٦٦ ـ ٢١٨ •

(٤٥) زاراوی كارگێری ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی كۆڕ ، پێشەكی و ڕێكخستنی د . كەمال مەزهەر ، بەغدا ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ، وە زاراوی هەمەچەشنە ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی كۆڕ ولیژنەكانی ، پێشەكی و ڕێكخستنی د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، بەغدا ١٩٧٤ . ( المصطلحات الادارية ، وضع ومناقشة مجلس المجمع العلمي الكردي؛ تقديم وترتيب د • كمال مظهر ، بغداد ، ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ، ومصطلحات متنوعة ، وضع ومناقشة مجلس المجمع العلمي الكردي ولجانه ، تقديم وترتيب د . عبدالرحمن الحاج معروف ، بغداد ، ١٩٧٤ ) •

وعدا القواميس والقويميسات التي اسلفنا ذكرها آنفا فان ثمة بعض الاعمال المدرجة بهذا الشأن ابرزها :

القاموس الموحد ( كردي ـ كردي ) الذي ما زالت لجنة القاموس في المجمع العلمي الكردي منهمكة في وضعها ، وفق الخطة الموضوعة له ويعتبر أعظم القواميس الكردية وأقربها الى النهج العلمي ، وهو يحوي جميع مفردات اللغة الكردية على اختلاف لهجاتها .

في الاتحاد السوفيتي :

في أعقاب ثورة اوكتوبر تعاظم الاهتمام بالدراسات الكردية اكثر فاكثر فكان وجود الاقلية الكردية في هذه البلاد وما نجم من ثورة اوكتوبر العظمى من تحولات عظيمة في الحياة الجديدة من الاسباب التي افضت الى تطور وازدهار الدراسات الكردية السوفيتية ، ومن الآثار المهمة لذلك ان شمر ابناء هذه الاقلية انفسهم عن سواعد الجد ، وأقبلوا على العمل في هذا الميدان بشكل منقطع النظير .

ولا شك في ان ازدهار التأليف القاموسي مرتبط في الاساس بالدراسات الكردية السوفيتية نفسها ، وهو في الحق أهم الاوجه البارزة المزدهرة ، فعلى سبيل المثال :

نشر سنة ١٩٣٣ في أريفان قاموس ارمني ـ كردي[٤٦] . وفي سنة ١٩٣٥ نشر قويميس المصطلحات الارمنية ـ الكردية[٤٧] . يقع الأول منهما

---

(٤٦) خەبەرناما ژ زمانێ فەلەیی ـ کورمانجی ، رەوان ، ١٩٣٣ . ( قاموس اللغة الارمنية ـ الكردية ، اريفان ، ١٩٣٣ ) .

(٤٧) خەبەرناما تێرمینۆلوجیێ یا فەلەیی ـ کورمانجی ، رەوان ، ١٩٣٥ . ( قاموس المصطلحات الارمنية ـ الكرمانجية ، اريفان . ١٩٣٥ ) .

في نحو ( ٣٠٠ ) صفحة والثاني في (٥٠) صفحة • ومع ان القاموسين يضمان بعض المفردات التي لا تتفق وقواعد اللغة الكرديــة الا انهما استطاعا ان يلعبا دورهما المطلوب •

وفي عام ١٩٥٧ نشر قاموس ارمني ــ كردي جديد[٤٨] ، يقع في (٣٥٢) صفحة ويضم (٢٣) الف كلمة • وعلى الرغم من ان هذا القاموس افضـــل وانجح من سوابقه الا انه لا يخلو من العيوب والنواقص الكثيرة ، وبخاصة ما يتعلق بقسمه الكردي الذي يحوي من المفردات الروسية والارمنية التي لا يستخدمها الكرد انفسهم ، والتي الحق ببعضها اللواحق ( ي ، تى ، چى ) بتكلف وتعسف ظاهرين ، ونحت منها العديد من الكلمات المعوجة الخاطئة • وفي العام ذاته نشر قاموسان اخران : أحدهما روسي ــ كردي[٤٩] والثاني كردي ــ روسي[٥٠] • اما الاول وهو من وضع الدكتــور ي • فاريزوف فيقع في نحو (٧٨٢) صفحة و (٣٠) الف كلمة ، واما الثاني وهو من تأليف الدكتور چركزي بكو ( بكايف ) فيقع في (٦١٨) صفحة و (١٤) الف كلمة•

---

(٤٨) سەمەندێ سیابەند ، ئارامێ چاچان ، خەبەرناما ئەرمەنی ــكوردی ، یەریڤان ، ١٩٥٧ . ( سمند سيابند . آرامى چاچان ، القامــوس الارمني ــ الكردي ، اريفان ، ١٩٥٧ ) .

(٤٩) И.О. Фаризов. Русско-курдский словарь, Москва, 1957

( ى • و • فاريزوف ، قاموس روسي ــ كردي ، موسكو ، ١٩٥٧ ).

(٥٠) Ч.Х. Бакаев. Курдско-русский словарь, Москва, 1957

( ج • خ باكايف ، قاموس كردي ــ روسي ، موسكو ، ١٩٥٧ ) .

وان كلا من القاموسين يسد فراغا ملحوظا في الدراسات الكردية السوفيتية. وان عالم الدراسات الكردية قناتي كوردو ( كوردوييف ) طبع سنة ١٩٦٠ قاموسا كرديا ــ (الكرمانجيةالشمالية) روسيا[٥١] وهو ثمرةجهوده المتواصلة خلال سنوات عديدة . ويعد وضع هذا القاموس مكسبا كبيرا في مجال وضع القواميس الكردية . ولعل بهذا يكتسب اهميته الكبيرة في تاريخ وضـــع القواميس الكردية . لقد بذل المؤلف جهدا كبيرا لجمع مفردات قاموســه وراجع الكثير من المصادر والمراجع مستخدما معظم مفردات اللهجـــات المختلفة للكرمانجية الشمالية ، و ( أحيانا الكرمانجية الجنوبية ) وبذلـك استطاع ان يجمع زهاء (٣٤) الف كلمة تشكل القسم الغالب منها اللهجـة الكرمانجية الشمالية وهذا ما يدل على نجاحه .

بذل الاستاذ كوردو في كيفية ترجمة الفاظ قاموسه وتفسيرها مجهودا فنيا رائعا ، فقد شرحها بلغة فصيحة سلسة سهلة ، وبمفردات مطابقة أشــد المطابقة ، مستوفيا بالشرح والتفسير بالروسية ما يحتمله اللفظ من المعــاني المتعددة ، مستشهدا بالمزيد من الامثال الكردية السائرة ، ومأثورات القول على غنى اللغة الكردية وسعتها . كما انه ادخل اكثر الالفـــاظ في الجمل مترجما اياها الى الروسية ، ممهدا بذلك الطريق الى فهم معانيها ، وتيسيرا لهما ، شارحا باقتضاب وابانة معنى كل كلمة ليس في الروسية ما يقابلها .

ومما يدل على اهمية هذا القاموس وفضله ما يقوله ى . ى. تسوكرمان

---

(٥١) К.К. Курдоев. Курдско-русский словарь, Москва, 1960

( ق . كوردوييف ، قاموس كردي ــ روسي ، موسكو ، ١٩٦٠ ) .

الكردية : « انه اكبر سفر عرف حتى الآن في الدراسات الكرديـــــــــة السوفيتية »(٥٢) .

ومنذ عشر سنين يعمل موظفو القسم الكردي في جـامعة لينينگراد باشراف قناتي كوردو لوضع قاموس كردي ( الكرمانجية الجنوبيـــة ) ـ روسي ، وهو معد للطبع .

ان هذا القاموس الذي يجمع بين دفتيه زهاء ٣٠ الف كلمة كردية لمن المنجزات العلمية الموفقة النادرة ، وثمرة جهود كبيرة مضنية ونتـاج مراجع ومصادر جمة غنية . ومما يذكر ان الدكتور مكسيم خامو العامل في القسم الكردي في اريفان عاكف منـذ أعـوام على وضـع قاموس للمصطلحات والكنايات الكردية الروسية وهو دون ريب عمل مهم ورائع (٥٣) .

وفي ختام هذا الجزء من كلامي اود ان استرعي انتباه القارىء الكريم الى ان مخطوطة القاموس الكردي ـ الروسي الذي وضعه الاكاديمي اي٠آ اوربيلي خلال عام (٢٠) معدة هي الاخرى للطبع من قبل العاملين في القسم الكردي في لينينگراد وفي خلال المقالة التى دبجها اي ٠ اي ٠ تسوكرمان و

---

(٥٢) И.И. Цукерман. Очерк курдской грамматики, Москва, 1962, стр. 35

( ى ٠ ى ٠ تسوكرمان موجز قواعد اللغة الكردية ، موسكو ، ١٩٦٢).

(٥٣) ان كاتب هذا المقال قد اطلع على مخطوطتي هذين القاموسين ـ الأول منهما موضوع فى لينينغراد برئاسة قەنالي كوردو والثاني لايزال يعمل فيه مكسيم خامو فى يريڤان .

ز . س . موسيليان حول هذا القاموس يبدو انه عمل رائع وفذ[٥٤] .

**في اوروبا :**

عقب صدور كتاب ر.ف. جاردين حول قواعد اللغة الكردية الذي طبعه في بغداد سنة ١٩٢٢[٥٥] والذي يضم قويميا كرديا ـ انجليزيا (ص ٥٥ـ١١٤) لانجد في اوربا نشاطا في مضمار الدراسات الكردية يذكر، وبخاصة في حقل وضع القواميس ، حتى ان الاعوام الاخيرة لم تشهد بهذا الصدد نشر شيء جدير بالذكر . والذي ظهر في الآونة الاخيرة هو :

قاموس كردي ـ فرنسي ـ انجليزي نشرته جويس بلاو سنة ١٩٦٥ في باريس[٥٦] . ومما يشوب هذا القاموس من عيوب عدم ايفائه بالكثير من

---

(٥٤) И.И. Цукерман, Ж.С. Мусаэлян. Курдско-русский словарь акад. И.А. Орбели, "Тезисы докладов II-й годичной научной сессии ЛО ИНА", март 1966, стр. 69-70

( ى . ى . تسوكرمان ، ژ . س . موسيليان ، القاموس الكردي ـ الروسي للاكاديمي ى . آ . اوربيلي ، « مجمل محاضرات الحلقات العلمية الدورية للسنة الثانية لمعهد دراسات الاقوام الاسيوية في لينينغراد » ، مارت ١٩٦٠ ، ص ٦٩ ـ ٧٠ ) .

(٥٥) R. F. Jardine. Bahdinan Kurmanji; a Grammar of the Kurmanji of the Kurds of Mosul division and surrounding districts of Kurdistan. Baghdad, 1922.

(٥٦) Joyce BLAU. Dictionnaire kurde—Francais—Anglais, Paris, 1965.

المفردات الضرورية البارزة وقصوره في استعمال الجمل والامثلة للتفسير والايضاح .. ومع ذلك فانه والحق يقال عمل قيم وذو فائدة جمة وله شهرة فى الدراسات الكردية .

ومما يستحق التقدير ان العالم الكردي الشهير الاستاذ توفيق وهبي نشر في عام ١٩٦٦ بالتعاون مع س . ادمونس قاموسا كرديا ـ انجليزيا(٥٧). وهو من الانجازات العظيمة في الدراسات الكردية عموما ومن القواميس الكردية الناجحة خصوصا. ومما يزيد من قيمة هذا القاموس دفع كثير من الاشكالات والمعضلات وحلها بطريقة علمية . ولهذا الانجاز الرائع من القيمة والفضل ما اكسبه في اوساط المشتغلين بالدراسات الكردية صيتا ذائعا .

استخدم في هذا القاموس اكثر المفردات في جمل قصيرة سهلة ، وتحقق بذلك امران ! تفسير معانيها بصورة اوضح واعانة القارىء على طريقة استعمالها في الجمل . ولعل اسلوب واضعي هذا القاموس يتفق ورأي الاكاديمي الروسي ل.ف . شيربا ، الواضع الشهير للقواميس من ان: « الفرق بين كلمة في هذه اللغة واخرى في تلك لا يكمن في ترادفهما وإشتراكهما في المعنى الواحد حسب وانما يكمن في سلسلة من العلاقات المتباينة المتشابكة بين اساليب استعمالاتهما »(٥٨) .

---

(٥٧) Taufig Wahby & C. J. Edmonds. A Kurdish—English dictionary. London, 1966.

(٥٨) Л.В. Щерба. Опыт общей теории лексикографии, "Известия ОЛЯ АН СССР", № 3, Москва, 1940

( ل . ف . شيربا ، التطبيقات العامة لنظرية وضع القواميس ، انباء اكاديمية العلوم السوفيتية ، العدد ٣ ، موسكو ، ١٩٤٠ ) .

وبغض النظر عن بعض النواقص الهينة جدا لهذا القاموس فان مـــا يمكن ان يؤاخذ عليه في نظري هو اعتماد اصول الكلمات في ترتيبه اولاً ، واتباعها بما يشتق منها من المفردات ثانيا،ومع ما لاتباع هذه الطريقةالمعتمدة لدى بعض علماء اوروبا في ترتيب القواميس الكردية من تيسير طبعها الا انها لاتيسر سرعة الوصول الى الكلمة المطلوبة ، هذا فضلا عن افتقار اللغـــة الكردية في مرحلتها الراهنة الى الابحاث العلمية التي تثبت اصول الكلمات وجذورها ، ليس من المستبعد والحالة هذه ان لاتندرج بعض الكلمـــات تحت اصولها وجذورها .

ومما يذكر ان دار النشر العالمي في امريكا نشرت سنة ١٩٦٥ قويميسا انجليزيا ــ كرديا [٥٩] يقع في (٣٠) صفحة وسجلت معه ست اسـطوانات لتيسير التحدث بالكردية للسياح .

كما طبع ارنست مكاروس سنة ١٩٦٧ قاموسا كرديا ــ انجليزيـا [٦٠]، وللاسف فانه مشوب بكثير من النواقص والعيوب ، وبخاصة في ترجمـة المفردات وتفسير معانيها وترتيبها واملائها .



وصفوة القول فأن ما نشر من القواميس الكردية حتى الان يكـاد يربو على (٤٠) قاموسا وقويميسا يؤلف لنا اليوم كنزا صغيرا لا بأس به [٦١].

---

(٥٩) Kurdish, The world publishing company Cleveland and New York, 1965.

(٦٠) Ernest N. McCarus. A Kurdish — English dictionary, dialect of Sulaimania, Iraq. Ann Arbor (Michigan), 1967.

(٦١) من الجدير بالذكر ان القسم الاعظم من القواميس الكردية المنوه بها هنا توجد في مكتبة المجمع العلمي الكردي العامرة .

الا ان معظم هذه القواميس تفتقر لاسباب كثيرة ــ الى الاسلوب العلمي في الوضع والترتيب ، ومع ذلك فلا مناص من الاعتراف بان ما انجز منه فى هذا الميدان يعد نسبيا خطوة كبيرة ، ويمكن القول بان لنا عددا من القواميس الناجحة .

اما بالنسبة للقواميس القديمة فان اثنين منها ناجحان ، هما القاموس الايطالي ــ الكردي ( ماوريزو گارزوني ) ، والقاموس الكردي ــ الفرنسي لـ ( آ ـ جابا ) .

ومن الواضح ان العمل فى ميدان وضع القواميس الكردية اخذ يحتل مكانه الجدير به في الحياة العلمية والثقافية للشعب الكردي ، وان عددا من الاساتذة المخلصين من امثال الاستاذ توفيق وهبي ، وقناتي كوردو ( كوردوييف ) والشيخ محمد الخال ، وگيو الموكرياني ، وآية الله مردوخ وعلاء الدين سجادي ، وچركزي بكو (باكاييف) وجمال نبز وايڤان فاريزوف ، وسمند سيابند ، وجگرخوين قد خطوا في هذا المضمار خطوات كبيرة ، ودخلوا تاريخ الثقافة الكردية من باب واسع بما قدموه في حدود قدراتهم وامكاناتهم من انجاز حفظا للغة امتهم . وان كلا من الاساتذة توفيق وهبي وقناتي كوردو والشيخ محمد الخال موضع اشادة وتثمين الكثير من المستشرقين الاجانب .

وبالرغم من حسم بعض المشكلات المتعلقة بعلم الكلمة عموما وعلم تأليف القواميس خصوصا في حقل وضع القواميس الكردية ، الا ان في اللغة الكردية كثيرا من مصطلحات علم الكلمة وعلم القواميس [illegible] تتناوله الفكر ولم يهتد اليه العلم .

وهكذا يتضح فان تأليف القواميس قائم على نهجين : نظري وتطبيقي ،

اما الاول فهو ما يستنبط استنباطا علميا كحصيلة للبحث والنظر • واما الثاني فهو التطبيق لهذا النهج • وان بين النهجين علاقة وثيقة ويصاحب احدهما الاخر في كل خطوة يخطوانها • ولن يوفق اي واضع للقواميس باعتماد الجانب التطبيقي وخبرته الفردية فقط فى التأليف مالم يشفعه بالجانب النظري • والعكس صحيح •

ومما يذكر ان بعض القواميس الكردية انما وضعت على اساس نظري محض ، وان مؤلفيها انما وضعوها بجهدهم الشخصي وخبرتهم الفردية التى اوصلتهم الى نتائج ناجحة • ولكن للاسف لم يكتب شيء باللغة الكردية عن علم القواميس وذلك ما يشكل عقبة كأداء في طريق واضعي القواميس الكردية المحترمين •

وواضح ان اللغة الكردية ولا سيما في كردستان العراق ، وان كانت سائرة قدماالى امام الا انها يجب ان يرافقها تطور متناظر في الميدان النظري لوضع القواميس ايضا لكي يظهر الى الوجود قواميس ثمينة تجمع بين الجانب النظري والتطبيقي جنبا الى جنب(*) .

---

(*) نشر هذا المقال في العدد الاول من المجلد الثالث من « مجلة المجمع العلمي الكردي » ، بغداد ، ١٩٧٥ ، ص ٧٠٥ ــ ٧٢٨ •

# ناوەرۆک

